www.alibapir.com

**واقیعی دژواری ئۆممەت - هۆکار و چارەسەر**
**نووسین: عەلی باپیر**
مافی لە چاپدانەوەی پارێزراوە بۆ نوسینگەی تەفسیر
چاپی یەکەم ١٤٤١ز - ٢٠٢٠ك



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر
عــەلی بــاپیر (نووسەر)
واقیعی دژواری ئۆممەت - هۆکار و چارەسەر
١٤٤ لاپــەڕە
١٤ * ٢١ سـم
بابـەت : ئایینی
ISBN : 978-99-22-632-11-7

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٢١٩ ) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

**خـەتی بـەرگ :** نـــەوزاد کۆیــی
**دیزاینی ناوەوە :** زەردەشت کاوانی

www.alibapir.com

مەوسووعەی

بەرەو باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن

# واقیعی دژواری ئوممەت

## هۆکار و چارەسەر

کتێبی ١

نووسینی

عەلی باپیر

www.alibapir.com

هەرێمی کوردستان - عێراق
سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
هۆبەی سپاردنی کتێب



اقليم كوردستان - العراق
رئاسة مجلس الوزراء
وزارة الثقافة والشباب
المديرية العامة للمكتبات العامة
شعبة ايداع الكتب

Kurdistan Regional – Iraq / Council of Ministers
Ministry of Culture & Youth – G.D. of Public Libraries

ژمارە: ۸٦٠
رۆژ ۲۷ /نەورۆز/۲۷۱۹ کوردی

العدد:
التاريخ ۲۰۱۹/٤/۱٦

## بۆ / دەرەوەی هەرێم

**بابەت/ ژمارەی سپاردن**

ئاماژە بەرەزامەندی وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان / بەڕێوەبەرایەتی گشتی دیوان / بەڕێوەبەرایەتی یاسا بە نووسراویان ژمارە (۱۹۰۹/۱/٤ لە ۲۰۱۹/٤/۱٦)

بە پێی یاسای چاپەمەنی ژمارە (۱۰)ی ساڵی ۱۹۹۳ ژمارەی سپاردنی ساڵی (۲۰۱۹) درا بەم کتێبەی کەلە خوارەوە ناوی هاتووە ، لەچاپخانەکەتان چاپ بکرێت بەتیراژەی (۱۰۰۰) دانە بۆهەر کتێبێک، بەمەرجێک (٥) دانە بۆ بەشی سپاردن رەوانە بکەنەوە.

| ژمارە | ناوی کتێب | ناوی نوێەریان وەرگێر | بابەت | ژ.سپاردن |
|---|---|---|---|---|
| ۱ | نضرات فاحصه فی قضایات شاخصه | علی باپیر | ئایینی | ۳۷۹ |
| ۲ | واقیعی دژواری ئومەت هۆکارو چارەسەر | علی باپیر | ئاینی | ۳۸۰ |
| ۳ | بەرەو بانگەوازێکی ڕاست و ڕەسەن | علی باپیر | ئاینی | ۳۸۱ |

**سەرباز جەوهەر محمد**
**ج/بەڕێوەبەری گشتی کتێبخانە گشتیەکان**
**۲۰۱۹/٤/۲۸**



تێبینی:
۱-دەستەواژەی سپاردن بەم شێوەیە دەنووسرێت،لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان /هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی (.....)ساڵی ۲۰۱۹ پێدراوە.
۲-هەرچاپخانەیەک پابەند نەبێت بەناردنەوەی (٥)دانە لە کتێبەکە ژمارەی سپاردنی نادرێتێ.

وێنەیەک:
-کارگێری خویەتی
-هەلگرتن

library.kurdistan@yahoo.com
Iraq - KRG – Erbil – Behind MOCY
هەرێمی کوردستانی عێراق – هەولێر – شەقامی کوردستان – پشت وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
اقليم كوردستان العراق – أربيل – شارع كوردستان – خلف وزارة الثقافة و الشباب

www.alibapir.com

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱتَّقُونِ ﴿٥٢﴾ فَتَقَطَّعُوٓاْ
أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ زُبُرٗاۖ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾ المؤمنون

له تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com

# پێشکەش بێ

بەهەر براوخوشکێکی مسوڵمان کە دڵسۆزانە تێدەکۆشێ:

١ـ سەرەتا خۆی باش لەوەحیی بەرجەستەی خوا لەقوڕئان وسوننەتدا، تێبگات و بەهۆیەوە پێبگات.

٢ـ پاشان خەڵك و دەوروبەریشی تێبگەیەنێ و پێبگەیەنێ و، بەهاوکاریی براوخوشکانی هاوبڕوای،گۆڕانکاریی ووەچەرخانێك لەوڵاتی دا وەدی بێنێ.

٣ـ تاکو سەرەنجام بەهەوڵ و هیممەتی هەمووﻻیەك، ئۆممەتی پەژموردە ببووژێتەوەو، باری ﻻری ڕاستبێتەوە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com





## پێشەكی و پێناسەی ئەم مەوسووعەیە

إنَّ الْحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَن يَهْده اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب.

أَمَّا بَعْـــــدُ:

فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيثِ كَلاَمُ الله، وَخَيْرَ الْهَدِي هَدْيُ مُحَمّد صَلّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار.

www.alibapir.com



**خوێنەرە بەڕێز و خۆشەویستم!**

لەم پێشەکییەدا بە پێویستی دەزانم: یەکسەر بێمە سەر ئەسڵی مەبەست: دوای ئەوەی - ستایشی شایستە و سوپاسی پێویست بۆ خوای بەخشەر - خوای میهرەبان یارمەتیی دام لە تەمەنی ڕابردوومدا[1]، چەندان کتێب و بەرهەم لە زۆربەی بوارەکان دا، پێشکەش بکەم، کە زۆربەیان دووبارە و چەند بارە چاپ کراونەتەوە و، هەیانە پێنج شەش جار، هەروەها وێڕای ئەوەی کە بەشێکیان لە ئەسڵ دا، بە زمانی عەرەبیی پێشکەش کراون، بە تایبەت (موسوعة: الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)، کە لە چاپی دووەمی دا: دوازدە (١٢) کتێبە، ژمارەیەکی باشیشیان لە زمانی کوردییەوە، وەرگێڕراونە سەر زمانەکانی: عەرەبیی و فارسیی، هەندێکیشیان بۆ ئینگلیزیی و تورکیی و، بەرنامەی بەردەوامبوون لەسەر وەرگێڕانیشیان هەیە و کاری لەسەر دەکرێ.





بەڵێ بەڕێزان! دوای تێپەڕبوونی تەمەنێك - دەوری چل (٤٠)ساڵ - لە لێکۆڵینەوە و نووسین، بە پێویستم زانی:

لە دوو توێی زنجیرەیەکی دوازدە (١٢) ئاڵقەیی، دەشتوانین بڵێین: (لە مەوسووعەیەکی دوازدە کتێبی) دا، بە ناوونیشانی:

(مسوڵمانینە! با باشتر تێبگەین و پێبگەین)، چەند کتێب و بەرهەمێك بخەمە بەردیدی ئێوەی بەڕێز و خۆشەویست، وەك:

---

(١) لە ساڵی (١٩٨١ز)دا دەستم بە نووسین کردوە، کە ئەو کاتە تەمەنم: ١٩ - ٢٠ ساڵ بوو و یەکەمین بەرهەمم (ڕێبازی تێکۆشان) بوو، کە بە دەستنووسیی لێم ون بوو.

www.alibapir.com



ئەنجامگیریی و گوشراو و پوختەی ئەوە، كە بەڕاست و تەواوی دەزانم، لە بارەی چۆنیەتی تێگەیشتنی ئیسلام و، پێوە پابەند بوونیەوە، لەسەر ئاستی تاك و كۆی مسوڵمانان و، لە هەموو بوارەكانی مسوڵمانەتیی و دینداریيان دا و، بۆ هەموويان بە نێر و مێ و ورد و درشت و، تێكڕای مەشرەب و ڕەوتەكانیانەوە بەبێ، جیاوازیی.

ئێستاش بەرلەوەی بێینە سەر قسەكردن لەسەر نێوەڕۆكی ئاڵقەكانی ئەم زنجیرەیە(یان: كتێبەكانی ئەم مەوسووعەیە) و ناساندنیان، بە باشی دەزانم: بە خێرایی چاوێك بە كۆی كتێب و بەرهەمەكانی ڕابردووم دا، بگێڕین و، بە پێی جۆری نێوەڕۆكیان، پۆلێنیان بكەین، چونكە سوپاس و ستایش بۆ خوای بەخشەر و بە بەزەیی:





هەر لە سەرەتای تەمەنمەوە، جۆرێك لە نەخشە و بەرنامەم هەبووە، لە پێشكەشكردنی بەرهەمەكانم دا، بە هەموو جۆر و شێوازەكانی پێشكەشكردنیانەوە:

١)- {پوختەیەك دەربارەی ئیسلام}:

ئەم كتێبە یەكەمین بەرهەم بوو، «دوای ڕێبازی تێكۆشان» لە ساڵی (١٩٨٣ز)دا نووسیم و، لە ساڵی (١٩٨٤ز)دا چاپكراو، تێیدا هەوڵمداوە، باسی كۆی ئیسلام بكەم، لەبەر ڕۆشنایی سوورەتی (الفاتحة)دا، كە بە بڕوای بەندە: (الفاتحة) خۆیشی خولاسەی قورئان و ئیسلامەو، شایانی باسە: دواتریش لە ساڵانی (٢٠٠٤-٢٠٠٥ز)دا، لە سجنی (كرۆپەر)ی ئەمریكایی دا، مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)م، هەر لەبەر تیشكی سوورەتی (الفاتحة)دا، نووسی، ئەو مەوسووعەیەش لە چاپی دووەمی دا:

www.alibapir.com


دوازده (١٢) کتێبە، لە زیاتر لە چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕەدا «وەك پێشتریش باسم کرد».

٢)- {زنجیرەی: دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان}:

کە لە ساڵی (١٩٨٥ز)دا، سێ ئاڵقەی: (١و٢و٣)ی پێکەوە چاپ کراون، ئەسڵی وتووێژەکانیش لە ساڵانی: (١٩٨١و ١٩٨٢ز)دا، ڕوویاندابوو.

ئەمیش دووەمین بەرهەم بوو، لە سەردەمی ڕژێمی بەعس دا، بە ئاشکرا چاپ بکرێ و، ئامانجیش لێی: بەرپەرچدانەوەی ڕێچکە مرۆڤکردەکان و، بەرگریی لێکردنی ئیسلام و، خستنە ڕووی ڕووی گەش و جوانی بوو.





٣)- {خواناسیی، ئایین، ئیمان: ڕاستییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوە و، ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە}:

ئەمیش دیسان لە نێوان ساڵانی: (١٩٨٥- ١٩٨٦ز)دا نووسرا، بەڵام چاپکردنەکەی دواکەوت و، مەبەستیش لێی: خستنەڕووی کۆی ئیسلام بوو، وێڕای ڕەخنە لێگرتنی بیرۆکە نەیارەکانی.

٤)- {مسوڵمانی کامڵ}:

ئەمیش زووتر و لە هەشتایەکان و، سەرەتای نەوەدەکان دا نووسرا، بەڵام لە ساڵی (١٩٩٧ز)دا چاپ کراو، ئەو ناوونیشانەش مەبەست پێی: پێناسەی مرۆڤی مسوڵمان بوو، وەك تاك، لەم سێ (٣) بوارە سەرەکییەدا:

www.alibapir.com





١- بیروبڕوا.

٢- خواپەرستیی.

٣- ڕەوشت و ئاکار.

کە دواتر ئەو پڕۆژەیە، لە کۆتایی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو و، سەرەتای سەدەی بیست و یەك دا، تەواو کرا، هەرچەندە چاپکردنی دواکەوت و، دواتریش لە سێ مەوسووعەدا بەرجەستە بوو:

**٥)- مەوسووعەی: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی (شەش بەرگ).**

**٦)- مەوسووعەی: خوا پەرستیی ئیسلامیی (چوار بەرگ).**







**٧)- مەوسووعەی: ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی (یەك بەرگی گەورە).**

مەبەستیش پێیان خستنە ڕووی: هەر سێ پێکهێنەری بنەڕەتیی تاکی مسوڵمان بوو:

١- ئیمان و عەقیدە. ٢- خواپەرستیی. ٣- ڕەوشت و ئاکار.

دواتریش کتێب و بەرهەمەکانی دیکەم بەردەوام بوون، کە ژمارەیەکی زۆریان وتار و دەرسەکانم بوون، کە دەنووسرانەوە و، دەتوانم کۆی بەرهەمە فیکرییەکانم، هەتا ئەم تاوە (لحظة)ی ئەم دێڕانەی تێدا دەنووسم: (٢٠٢٠/٣/١ز) بەرانبەر(٦ / رجب / ١٤٤١ ك) بۆ حەڤدە (١٧) تەوەر دابەش بکەم، بەمجۆرەی خوارێ:

**١)- تەوەری یەکەم: باسی ئیسلام بە گشتی:**

١- پوختەیەك دەربارەی ئیسلام، چاپی ٢ /٢٠٠٦.

www.alibapir.com



٢- خواناسیی، ئایین، ئیمان، چاپی ٣ /٢٠٢٠ز.

٣- موسوعة: الإسلام كما يتجلى في كتاب الله، ط ٢ /٢٠١٨-٢٠٢٠م.

٤- حوارات ساخنة حول قضايا راهنة: في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة، ط ٢ / ٢٠١٨.

٢)- تەوەری دووەم: ئیمان و عەقیدە:

١- ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی (شەش بەرگ)، چاپی ٢٠٠٦/١-٢٠٠٨ چاپی ٢٠١٦/٢.

٢- ڕوونكردنەوەی عەقیدەی طەحاویی، چاپی ١/ ٢٠١٥.



٣-ژیان لە سایەی ئیمان و ڕەواندنەوەی گومانەكان، چاپی ١/ ٢٠١٧.

٤- درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، چاپی ٢٠٢٠/٢ز.

٥- بینینی خوای بەرزو مەزن لە دنیاو دوارۆژدا، چاپی ٢٠١٥/١.

٣)- تەوەری سێیەم: خواپەرستیی:

١- خواپەرستیی ئیسلامیی (چوار بەرگ)، چاپی ٢٠٠٠/١ چاپی ٢٠٠٩/٢.

٢- مزگەوتەكانی كوردستان، لە نێوان ئاوەدانكردنەوە و وێرانكردن دا، چاپی ١٩٩٩/١.

٣- مینبەر و میحڕاب، چاپی ١ / ٢٠٢٠ز.

www.alibapir.com





٤)- تەوەری چوارەم: قورئان و سوننەت:

١- با لە خزمەت قورئان دا بین! چاپی ١/٢٠٠٨چاپی ٢/٢٠١٥

٢- قورئان و سوننەت وەك ڕووح و جەستە تێکهەڵکێشن، چاپی١ / ٢٠٢٠ز.

٣- لێکۆڵینەوەیەك لە بارەی بوون و نەبوونی نەسخ لە قورئان دا، چاپی ١ / ٢٠١٢.

٤- پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، چاپی ١/٢٠٠٩ چاپی ٢٠١٣/٣.

٥- پێناسە و گرنگیی و پێویستیی: ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، چاپی یەك/٢٠١٨.

١٧

٦- مەلای گەورە و تەفسیرەکەی و، چەند سەرنجێك، چاپی ١، ٢٠١١ز).

٥)- تەوەری پێنجەم: خوو ڕەوشت:

١- مەوسووعەی: ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی، چاپی ١/ ٢٠١٥ز.

٢- خوو ڕەوشتی پەسند، سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە، چاپی ١ / ٢٠٠٧.

٣- با وریا بین! دا ڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات، چاپی ١ / ٢٠٠٢ چاپی دوو/ ٢٠٠٦.

٤- چۆن هەڵس و کەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟ چاپی ١، ٢٠٠١ز.

٥- ئەدەب و ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان. چاپی ١ / ٢٠٢٠ز.

www.alibapir.com



٦)- تەوەری شەشەم: ئافرەت و خێزان:

١-ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا، بەرگی یەکەم، چاپی ٢٠٠٢/١ بەرگی یەك و دوو چاپی ٢٠١٣/٣.

٢- سروشت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی چەند ژنیی، لە تەرازووی شەرع و عەقڵ دا، چاپی ٢٠٠٩/١.

٣- ئافرەتی مسوڵمانی کورد و ئەرکی سەر شانی، چاپی ١ / ٢٠٠٣.

٤- بە دوور خستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین! چاپی ١ / ٢٠٠٧.



٧)- تەوەرەی حەوتەم: تەزکیەی نەفس:

١- یادی خوا، چاپی ١٩٨٧/١.

٢- ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون، چاپی ١٩٩٠/١ چاپی ٢٠١٢/٥.

٣- گەڕانەوە بۆ لای خوا، چاپی ٢٠٠١/١ چاپی ٢٠١٠/٥.

٤- گیانی ژیان، چاپی ٢٠١٥/١.

٥- گەنج و قەیرانی ڕووحیی، چاپی ١/ ٢٠١٧ز.

٨)- تەوەری هەشتەم: ئیسلام و حوکم:

١- ئیسلام و دەوڵەتداریی (چوار بەرگ)، چاپی ١ / ٢٠١٤-٢٠١٦.

www.alibapir.com




٢- سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونكردنەوەیەك، چاپی یەك / ٢٠٠٧.

٣- نظرات فاحصة في قضايا شاخصة، ط ٢٠١٩/١.

٤- چەند بابەتێكی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحیی دا، چاپی ١ / ٢٠١٠.

٩)- تەوەری نۆیەم: فیكر و فەرهەنگ و هونەر:

١- بیركردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع دا (پێنج كتێب)، چاپی ١ /٢٠١٩.

٢- چەند بابەتێكی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحیی دا، چاپی ٢٠٠٩/١ چاپی ٢٠١٥/٢.





٣- یاد و بۆنە و جەژنەكان و هەڵسەنگاندنێك، چاپی ٢٠١٣/١.

٤- زانایانی ئیسلام كێن و چۆنن؟!، چاپی ١/ ٢٠٠٢ چاپی ٣ / ٢٠١١.

٥- حوكمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە و هەڵسەنگاندنێك، چاپی١/ ٢٠١١ز.

١٠)- تەوەری دەیەم: بەرپەرچدانەوەی بیرۆكە نەیارەكان:

١- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچكان، چاپی ٣/ ٢٠٠٦.

٢- ئیسلام و كێشە هەنووكەییەكان، چاپی ١ / ١٩٩٨.

٣- چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم، چاپی ٦ / ٢٠١٩.

٤- تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەكانیان، چاپی ٢٠١٥/٣.

www.alibapir.com





٥- سیکۆلاریزم و دیموکراسیی لە ئەزموونی کوردستاندا، چاپی ٢٠١٦/١.

**١١)- تەوەری یازدەیەم: تەوژمی ئیسلامیی:**

١- ئیسلام و مسوڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا، چاپی ٢٠٠٦/١.

٢- چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان، چاپی ١ / ١٩٩٧.

٣- کار و پرۆژەی ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی تەم و مژی چەند تۆمەتێك، چاپی ٢٠٠٥/١ چاپی ٢/ ٢٠٠٦.

٤- پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی، چاپی ١٩٩٦/١.

٥- هەڵوەشاندنەوەی پەرگیریی چاپی٢/ ٢٠١٩ز.

٦- چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران، چاپی ١/ ٢٠٠١ز.

٧- ڕەوەندی کورد لە هەندەران و ئەرکی سەر شانی، چاپی ١/ ١٠١٢ز.

٨- بانگەواز بۆ لای خوا، چییە و چۆن و بۆچی و بە کێ دەکرێ؟ چاپی ١/ ٢٠٠٧ز.

٩- چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی، چاپی ١/ ٢٠٠٦ز.

**١٢)- تەوەری دوازدەیەم: مەسەلەی نەتەوایەتیی و هەرێمی کوردستان:**

١- سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلام دا، چاپی ٤/ ٢٠١٩ز.

www.alibapir.com





٢- کوردستان بۆ وێران بوو و، چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟ چاپی ١/ ١٩٨٩ز.

٣- حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغووت، چاپی ٢/ ٢٠٠٥.

٤- چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەمان دا، چاپی ١/ ١٩٩٢.

٥- ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان. چاپی ١/ ٢٠١٧ز.

٦- قورئان و پاکسازیی و چاکسازیی لە هەرێمی کوردستان دا، چاپی ١/ ٢٠١٨ز.

**١٣)- تەوەری سێزدەیەم: جم و جۆڵی ئیسلامیی:**







أ/ لە بارەی بزووتنەوەی ئیسلامییەوە:

١- دەرد و دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی، چاپی ١/١٩٩٠.

٢- بزووتنەوەی ئیسلامیی، لە دووڕیانی مان و نەمان دا، چاپی ١/١٩٩٣.

٣- بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاییندەیەکی گەش و ڕوون، چاپی ١/ ١٩٩٧.

ب/ لە بارەی کۆمەڵی ئیسلامییەوە:

٤- هێڵە گشتییەکان و بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵێکی ئیسلامیی ڕەسەن، چاپی ١/ ٢٠٠١ز.

٥- کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەکانی، چاپی / ٢٠٠١ز.

٦- ڕوونکردنەوەی هێڵە گشتییەکان و بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی، چاپی ٣ / ٢٠٢٠ز.

www.alibapir.com





٧- کار و پرۆژەی ئیسلامیی مان/ وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی (٢٠٠٥ز).

٨- ڕاپۆرتی: ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی، کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان/ وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی (٢٠١٠ز).

٩- چاو پێدا گێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێو خۆمان و، واقیعی دەرەکییمان/ وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی. (٢٠١٥/٥/٣٠ز).

١٠- زنجیرەی بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی، ئاڵقەکانی: (١، ٢، ٣، ٤) چاپی ١/ ٢٠٠٢ز.

**١٤)- تەوەری چواردەیەم: مێژووی ژیان و چاوپێکەوتنەکان:**

١- چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (١٩٦١-١٩٩١ز)، چاپی١ /٢٠١٥ز.

٢- بەرکولێکی کاروچالاکیی و ڕووداوو وێستگەکانی ژیانم/ چاپی ١ /٢٠١٨ز.

٣- سنووره قەدەغەکان مەشکێنن/ چاپی ٢ (٢٠٠٤ز).

٤- ئەشکەنجەو زیندان/ چاپی ٣ (٢٠٠٩ز).

٥- گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا/ چاپی ١ (٢٠١٠ز).

٦- خاتوون مەلاژن ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و، هاوسەرێکی ناوازە/ چاپی ١ (٢٠١٢ز).

**١٥)- تەوەری پازدەیەم: پێشمەرگایەتیی و جەنگ و جیهاد:**

www.alibapir.com




١- پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێیە و چۆنە؟/ چاپی ٤ (٢٠٢٠ز).

٢- کۆمەڵی خوا/ چاپی ١ (١٩٨٨ز).

٣- چۆن لە جیهاد تێبگەین؟/ چاپی ١ (١٩٩٨ز).

٤- جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك/ چاپی١ (٢٠٠٢ز).

٥- بۆ ئەوەی لەسەر جیهاد کردنمان قەرزدار نەبینەوە!/ چاپی١ (٢٠٠٢ز).

٦- جیهاد لە ڕێی خوادا: چییەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ؟/ چاپی ١ (٢٠٠٢ز).





٧- جەژنی قوربان و جەنگی قەڵاتووکان، چاپی ١ / ٢٠٢٠ز.

**١٦)- تەوەرەی شازدەیەم: زنجیرەی: بابەتە هەنووکەییەکان:**

ئەم زنجیرەیە تاکو ئێستا بیست و یەك (٢١) ئاڵقەی لێ دەرچووە، بەڵام زۆربەیان خراونە نێو تەوەرەکانی پێشووەوە، ئەوانەی ماون ئەمانەن:

١- گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا/ چاپی ١/ (٢٠٠٦ز).

٢- قوتابییان لەم هەل و مەرجەدا پێویستە چۆن بن و چی بکەن؟/ چاپی ١ (٢٠٠٨ز).

٣- قوتابییانی زانیاریی شەرعیی و، چەند سەرنج و ڕێنماییەك/ چاپی ١ (٢٠٠٧ز).

www.alibapir.com



٤- چۆنیەتیی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی/ چاپی ١ (٢٠٠٧ز).

٥- تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی، چییە و چۆنە؟ / چاپی ٢ (٢٠١٢ز).

**١٧)- تەوەرەی حەڤدەیەم: تەفسیری قورئان:**

تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

کە هەتا ئێستا (٢٠٢٠/٣/١ز) دوازدە (١٢) بەرگی لێ چاپکراوە، لە سەرەتاوە تاکو سوورەتی: (الحجر) و، هەتا سوورەتی (الحجرات)یش لە ژێر چاپەو، لەسەریشی بەردەوامم بە پشتیوانیی خوای بەخشەر.





**بەڕێزان، خوشکان و برایانی خۆشەویستم!**

ئێستاش دێینە سەر پێناسە کردنی ئەو زنجیرەیە - یان ئەو مەوسووعەیە -ی کە گوتم:

هەوڵدەدەم خولاسەو گوشراوی: تێگەیشتنی خۆم - کە بە تێگەیشتنی ڕاست و دروست و هاوسەنگی دەزانم - لە بارەی ناسینی ئیسلام و، چۆنیەتی پێوە پابەند بوونیەوە، لەسەر ئاستی: تاك و كۆ (الفرد والمجموع)ی مسوڵمانانی تێدا بخەمە ڕوو، لەیازدە (١١) خاڵاندا پێناسەی ئەم زنجیرەیە دەکەم:

(١)- ئەو زنجیرەیە - یان ئەو مەوسووعەیە-: {مسوڵمانینە! با باشتر تێبگەین و پێبگەین} بۆیە بەو جۆرە ناونراوە، چونکە:

www.alibapir.com





یەكەم: ویستوومە: ئاڕاستەی تێكڕای براو خوشكانی مسوڵمانمی بكەم، لە هەر جێیەك بن و، بە هەر زمانێك بدوێن - كە خوا پشتیوان بێ، دڵسۆزان تەرجەمەی دەكەن - .

دووەم: ویستوومە: برا و خوشكانی مسوڵمانم، ئاگادار بكەمەوە: كە ئەم واقیعە سەخت و دژوارەی ئۆممەتی ئیسلام - كە لە ئاڵقەی یەكەمی ئەم زنجیرەیەدا باسی دەكەین - زادە و بەرهەمی كرچ و كاڵیی مسوڵمانانە بە گشتیی، لە ڕووی لە ئیسلام تێگەیشتن و، پێوە پابەند بوونییانەوە، بە تەعبیرێكی دیكە:

ئەوە تێنەگەیشتوویی و پێنەگەیشتوویی مسوڵمانانە، لە ئایین و بەرنامەكەیان، كە بەو دەردەی بردوون و، بەو حاڵە شپرز و دژوارەی گەیاندوون.



كەواتە: پێویستە هەموو لایەكمان هەوڵبدەین: باشتر تێبگەین و پێبگەین.

یانی: باشتر لە ئیسلامی بەرجەستە لە وەحیی خوادا، تێبگەین و، پاشان تێیدا پێبگەین، بەهۆی چاك پێوە پابەندبوون و، جێبەجێكردنیەوە.

**بەڵێ بەڕێزینە!**

ئەم ئایین و بەرنامە تێرو تەواوەی خوای بەرز و بێ وێنە، بە وشەی بخوێنە (إقـرأ) دەستی پێكرد: ﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِی خَلَقَ ۝١ ﴾ العلق، دوایی بە هۆشیار كردنەوەو بێداركردنەوەی مرۆڤەكاندا گوزەری كرد: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ۝١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ۝٢ ﴾المدثر، سەرەنجام: ئەو كۆمەڵە مرۆڤە هۆشیارو بێدارە: عەقڵ هۆشیارو دڵ بێدار، خۆیان گۆڕی و

www.alibapir.com



پاك و چاك كردو، لە ئەنجامی ئەوەشدا: شایستەیی ئەوەیان هەبوو، واقیع و كۆمەڵگای خۆیان بگۆڕن: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ﴿١١﴾﴾ الرعد.

كەواتە: بۆ بووژاندنەوەی ئیسلام و، هەڵساندنەوەی ئۆممەتیش، لە هەر كات و شوێنێكدا، هەر دەبێ لەو خاڵەوە: هۆشیاریی و بێداریی، دەست پێبكرێتەوە.

(٢)- ئەم زنجیرەیە - هەتا ئێستا - لە دوازدە (١٢) ئاڵقە- یان: كتێب- پێكهاتوە، هەر ئاڵقەیەی كتێبێكی سەربەخۆ دەبێ و، بابەتێك، یان زیاتر لە بابەتێكی پێكەوە پەیوەست، دەگرێتە خۆی، ئەوەش ناوونیشانی ئەو دوازدە ئاڵقەیە- یان دوازدە كتێبەیە- بە پێی ڕیزبەندیی چاپ و بڵاوكردنەوەیان، لە ژێر ناوونیشانی ئەم زنجیرەیە- یان ئەم مەوسووعەیە- دا:



١- واقیعی دژواری ئۆممەت: هۆكارو چارەسەر.

٢- هەڵسەنگاندنێكی كاری ئیسلامیی.

٣- چۆنیەتی گۆڕینی كۆمەڵگا و پاكسازیی و چاكسازیی تێداكردنی.

٤- بەرەو بانگەوازێكی ڕاست و ڕەسەن.

٥- پایەكانی بوونناسیی و، ڕوونكردنەوەی ئیمان.

٦- خواپەرستیی، تەزكیە، تەقوا.

٧- بنەما گشتییەكانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان.

٨- تایبەتمەندییە ئیمانیی و فیكرییەكانی جەماوەری مسوڵمانان.

٩- ڕەوشتبەرزیی، دروشمی سەرەكیی جەماوەری مسوڵمانان.

www.alibapir.com


١٠- چوار بابەتی سیاسیی گرنگ و هەستیار.
١١- بنچینە گرنگەكانی تەبایی و یەكڕیزیی مسوڵمانان.
١٢- بنەڕەتەكانی مسوڵمانەتییەكی ڕاست و هاوسەنگ.

(٣)- ئەو دوازدە كتێبەی ئەم زنجیرە- یان ئەم مەوسووعە- یان لێ پێكهاتوە، لە ڕووی شێوەو چۆنیەتی ئامادەكرانیانەوە، جۆراو جۆرن:

هەندێكیان تازە نووسراون و ئامادەكراون و، هەندێكیشیان بەشێكیان تازە نووسراوەو، بەشێكیان پێشترو، پێكەوە ئامادەكراون و، بەشێكیشیان لە شوێنی دیكەوە گوازراونەوە، چ لە بەرهەمە كوردییەكانمەوە، چ لە بەرهەمە عەرەبییەكانمەوە، پاش تەرجەمە كردنیان و، دەستكاریی كردنیان.

٢٧

لە سەرەتای هەركام لەم دوازدە كتێبەشدا -لەڕێ خۆشكردنەكەیدا- چۆنیەتیی ئامادەكرانی ڕوون دەكەینەوە.

(٤)- لە ڕیزبەندیی (ترتیب) ئەو دوازدە (١٢) كتێبەشدا: پلەپلەیی (تدرُّج)ی لۆژیكیی ڕەچاوكراوە، بەمجۆرەی خوارێ:

**كتێبی یەكەم: {واقیعی دژواری ئۆممەت: هۆكارو چارەسەر}**

كراوەتە یەكەم ئاڵقەی ئەم زنجیرەیە (یان یەكەم كتێبی ئەم مەوسووعەیە)، چونكە باسی هەر شوێنێك و هەر كۆمەڵێك بكرێ، هەر بەشێكە لە ئۆممەت و پێیەوە پەیوەستە.

هەڵبەتە هەر دەردو نەخۆشییە گشتییەكانی ئۆممەتیشن، كە لەسەرجەم پێكهاتەكانیشی دا ڕەنگیان داوەتەوە و، تاك تاكی مسوڵمانانیش بەرانبەر بە ئۆممەتەكەیان بەرپرسیارن.

www.alibapir.com



کتێبی دووەم: {هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی}

ئەمیش کراوەتە ئاڵقەی دووەم، چونکە کاروچالاکیی و پڕۆژە ئیسلامییەکان، ئامانج لێیان بووژاندنەوەی ئیسلامە، لە نێو بەشێکی ئۆممەت و پێکهاتەیەکی دا، یان لە نێو سەرجەمی دا، بۆیە پێویستە هەڵبسەنگێنرێن و، لە تەتەڵەو بێژینگ بدرێن.

کتێبی سێیەم: {چۆنیەتیی گۆڕینی کۆمەڵگا و، پاکسازیی و چاکسازیی تێداکردنی}

دوای هەڵسەنگاندن (تقييم)ی کارو پڕۆژەی پێشوو، پێویستە، سەرێکیش بەرەو داهاتوو و ڕووەو ئاسۆی ئاینده هەڵبڕین و، بزانین لەمەودوا چی بکەین و، چۆن بکەین؟ بۆیە ئەو بابەتەش کراوەتە ئاڵقەی سێیەم.





کتێبی چوارەم: {بەرەو بانگەوازێکی ڕاست و ڕەسەن}

ئەمیش کراوەتە ئاڵقەی چوارەم، چونکە بانگەواز بۆ لای خوا (الدعوة إلى الله) گرنگترین و سەرەکییترین کاروپێکهاتەی پرۆسەی: گۆڕین و پاکسازیی و چاکسازیی تێدا کردنی کۆمەڵگایە.

کتێبی پێنجەم: {پایەکانی بووناسیی و، ڕوونکردنەوەی ئیمان}

ئەمیش ئاڵقەی پێنجەمە، چونکە: بووناسیی (معرفة الوجود)و، ئیمان، بناغەی مسوڵمانەتیی و دینداریی تاك و کۆمەڵن.

کتێبی شەشەم: {خواپەرستیی، تەزکیە، تەقوا}

ئەمیش ئاڵقەی شەشەمی زنجیرەکەیە، چونکە:

www.alibapir.com





أ/ ئەو سێیە: (خواپەرستیی، تەزكیە، تەقوا) بەرهەمی ڕاستەوخۆی: بوونناسیی و ئیمانن.

ب/ پێكهاتە سەرەكییەكانی مسوڵمانەتیی و دینداریی تاك و كۆمەڵن، بە تایبەت تاكی مسوڵمان.

**كتێبی حەوتەم: {بنەما گشتییەكانی جەماوەری مسوڵمانان}**

**كتێبی هەشتەم: {تایبەتمەندییە ئیمانیی و فیكرییەكانی جەماوەری مسوڵمانان}**

**كتێبی نۆیەم: {ڕەوشتبەرزیی، دروشمی، سەرەكیی جەماوەری مسوڵمانان}**

ئەم سێ كتێبەش بۆیە كراونە ئاڵقەكانی: (٧ و ٨ و ٩)ی زنجیرەكە-یان مەووسوعەكە-، چونكە: پاش ڕازانەوەی تاكەكانی مسوڵمانان بە: (خواپەرستیی، تەزكیە، تەقوا) لە سۆنگەی هەزمكردن و وەخۆ گرتن (إستیعاب)ی: (بوونناسییەكی ڕاست و، ئیمانێكی ساغ)ەوە، ئنجا كاتی ئەوە دێ، كە لە كۆ (مجموع)یاندا، تایبەتمەندییە گشتیی و، ئیمانیی و فیكریی و، ڕەوشتیی و ئاكارییەكانی، پێشینی باش و مسوڵمانانی ڕەسەن، لە خۆیان دا بەرجەستە بكەن.

**كتێبی دەیەم: {چوار بابەتی سیاسیی هاوچەرخی گرنگ و هەستیار}**

ئەمیش كراوەتە ئاڵقەی دەیەم، چونكە: دوای برینی قۆناغەكانی ڕابردوو و، سەرهەڵدانی مسوڵمانانێكی ئەوتۆ،[1] كە: (بنەما گشتییەكان و ، تایبەتمەندییە ئیمانیی و فیكرییەكان و، ڕەوشتی بەرزو جوان) لە خۆیاندا بەرجەستە بكەن و، خۆیانیان پێ برازێننەوە، مانای وایە:

---

(١) ئەو تۆ: بەو شێوەیە، بەو جۆرە.

www.alibapir.com





تواناو شایستەیی ئەوەیان پەیدا کردوە، کە بێنە مەیدانی کارو چالاکیی سیاسییەوەو، گۆڕانکاریی و پاکسازیی و چاکسازیی لە بوارەکانی: حوکم و سیاسەت و ئابووریی و گوزەران و، ئیدارەو، کۆمەڵایەتیی و ... هتد دا بکەن، بۆیە پێویستە لەو بارەوە بەرچاوڕوون و شارەزابن.

ئەو چوار بابەتە سیاسییە هاوچەرخە گرنگ و هەستیارەش، ئەمانەن: هاوپەیمانێتیی، بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، بەشدارییکردن لە حکومەتدا، گرنگیی ڕەوشت لە سیاسەتدا.

**کتێبی یازدەیەم: {بنچینە گرنگەکانی تەبایی و یەکڕیزیی مسوڵمانان}**

ئەمیش ئاڵقەی یازدەیەمی زنجیرەکە - یان: کتێبی یازدەیەمی مەوسووعەکە- یە، چونکە:

هەرچەندە مسوڵمانان هەمیشە پێویستە یەکڕەنگ و یەکدەنگ و یەك سەنگ بن و، ئەمەش: خوا بە یەکگرتن (توحید)و ئیمانەکەیان لە سەریان پێویست دەکات، بەڵام لە کاتێکدا دێنە نێو کایەی سیاسییەوەو، دەیانەوێ واقیعی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی خەڵکەکەیان بگۆڕن، زیاتر پێویستییان بەو تەبایی و یەکڕیزیی و هاوکارییەی نێوانیان دەبێ.

**کتێبی دوازدەیەم: {بنەڕەتەکانی مسوڵمانەتییەکی ڕاست و هاوسەنگ}**

بۆیە ئەمیش کراوەتە ئاڵقەی دوازدەیەم و کۆتایی، چونکە لە کاتێکدا مسوڵمانانی وڵاتێك و کۆمەڵگایەك، یان تێکڕای وڵاتان و سەرجەم ئۆممەت، ئەو قۆناغانەی ڕابردوو، دەبڕن، بە کۆ (مجموع) دێنە ئاستێکەوە، کە مسوڵمانەتییەك و دینداریيەکی ڕاست و هاوسەنگ ئەنجام بدەن.

www.alibapir.com



(٥)- ناوونیشانی ئەم زنجیرەیە: {بەرەو! باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن}

ئەم ناوو نیشانە، پاش بیركردنەوەی زۆر پێ گەیشتووم و، چەند ناوو نیشانێكی دیكەشم بە زەیندا هاتن، وەك:

١- مسوڵمانینە! با تێگەیشتووترو پێگەیشتووتر بین.

٢- باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتنی مسوڵمانان.

٣- بەرەو باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن.

٤- بەرەو هۆشیاریی و بێداریی باشتری مسوڵمانان.

بەڵام سەرەنجام ئەوەی كردوومەتە ناوونیشان، پێم پەسندتر بوو.







(٦)- كتێبەكانی ئەم زنجیرەیە، هەرچەندە هەوڵمداوە پوختە و گوشراوی تێگەیشتنی خۆمیان لەبارەی زۆربەی لایەن و ڕەهەندەكانی ئیسلامەوە، تێدا بخەمەڕوو، بەڵام بە بەدیلی كتێب و بەرهەمەكانی دیكەم دانانرێن، بۆ نموونە:

لە كتێبی پێنجەم دا، باسی: {پایەكانی بووناسیی} و {ڕوونكردنەوەی ئیمان}م كردوە، بەڵام بێگومان ئەو كتێبە نابێتە جێگرەوەی كتێبی یەكەمی: (موسوعة: الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) بە ناوونیشانی: (الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق والخَلْق)، هەروەها نابێتە جێگرەوەی: (مەوسووعەی: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی) كە شەش بەرگە.

هەروەها كتێبی شەشەم: (خواپەرستیی، تەزكیە، تەقوا) بەدیلی:

www.alibapir.com




(مەوسووعەی: خواپەرستیی) کە چوار بەرگەو، بەدیلی کتێبەکانی: (ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون) و (گیانی ژیان) و (گەڕانەوە بۆ لای خوا) نیە.

هەروەها کتێبی دەیەم: (چوار بابەتی سیاسیی هاوچەرخی گرنگ و هەستیار) بەدیلی (مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵەتداریی) نیە.

وێڕای ئەوەی کە چەند بابەتێکی وەك: (چەند بابەتێکی هونەریی) و (یادو بۆنە و جەژنەکان) لەم زنجیرە کتێبەدا نەهاتوون.

بە کورتیی: هەرچەندە ئەم زنجیرەیە- یان: مەوسووعەیە- دوا تێگەیشتن و حاڵی بوونەکانی بەندەی، بۆ زۆر بواری ئیسلام و، گەلێك ڕەهەندی دین و ژین و دینداریی و دنیاداریی، گرتوونە خۆی، بەڵام ناگونجێ بکرێتە جێگرەوەی کۆی بەرهەمەکانی بەندە.

(٧)- ئەم زنجیرە کتێبەم، وەك سەرجەم کتێب و بەرهەمەکانی دیکە، بۆ مسوڵمانان بە گشتی نووسیون، نەك بۆ کۆمەڵ و گرووپ، یان توێژو مەشرەبێکی تایبەت، حەزیش دەکەم هەر کەس دەکەوێتە بەردەستی، هەر بەوچاوە تەماشای بکات.

(٨)- کەم و زۆر لەم زنجیرە کتێبەدا، هەوڵم داوە، ئەوەی بە هەڵەو کرچ و کاڵیی و ناتەواویی دەزانم، لە هەر کۆمەڵ و گرووپ و توێژو مەشرەبێکی مسوڵمانان دا، لە ڕووی دڵسۆزییەوە پەنجەی بخەمە سەرو ڕەخنەی لێبگرم، ئنجا هیوادارم ئەو ڕەخنە گرتنانەم، بە دڵێکی ساغ و سافەوە فام بکرێن و، شتی دیکەیان تێوە نەپێچرێ و، لە شتی دیکەوە نەپێچرێن.

www.alibapir.com





(٩)- هەندێك لە بابەتەكانی ئەم كتێبانە - لە كتێبێكەوە بۆ كتێبێك - جۆرێك لە لێكچوون و بگرە دووبارە بوونەوەشیان تێدا دەبیٚ و، ئەوەش ئاساییە، چونكە كتێبی بەرزو بە پێزو بیٚ هەڵەی خوای میهرەبان و كارزانیش، بابەتە گەورەو گرنگەكان، بە زیاتر لە شێوازێك دێنیٚ و، دووبارە دەكاتەوە، بۆ زیاتر چەسپاندنیان لە عەقڵ و دڵی مرۆڤەكاندا، ئێمەش بەپێی توانا قورئان دەكەینە سەرمەشقمان لە شێوازەكانی دا.

(١٠)- شتێکی ئاشکراو بەڵگە نەویستە: کە ئۆممەتی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) لە تێکڕای مسوڵمانانی ئەهلی قیبلە پێکدیٚ، بە هەموو ڕەنگ و مەشرەب و مەزهەب و ناوونیشان و بۆچوونەکانیانەوە، هیچ کەسیش هەق و ڕاستیی ڕەها (مطلق)ی لەسەر تاپۆنەکراوە، منیش لەلای خۆمەوە: تێکڕای مسوڵمانانی نێو بازنەی ئیسلام، بە براو خوشکی خۆم دەزانم و، دۆستایەتیی (موالاة) ی کردنیان، بە فەرز دەزانم و، بە خۆشییان دڵخۆش و، بە ناخۆشییان دڵناخۆشم - بەپێی توانام - .

(١١)- هەتا مسوڵمانان بە گشتیی، لە قاوغ و قەپێلك و بازنە داخراوو تەسكەكانی: طائیفیی، مەزهەبیی، حیزبیی، تەوژم، مەشرەب، قوتابخانە ... هتد نەیەنە دەریٚ، بۆ نێو فەزاو بازنەی فراوانی وەحیی و شەریعەتی خوا، مەحاڵە لەو واقیعە سەخت و دژوارەی تێیكەوتوون، دەرباز ببن و، بێگومانیش:

تەنیا وەحیی خوا بە كەڵكی هەموو ڕۆژگارو شوێنێك دیٚ و، بەس وەحیی خوای عز وجل دەگونجیٚ تێکڕای مسوڵمانانی لەسەر كۆوەبن و، مسوڵمانان تەنیا لە سایەی وەحیی دا، جێیان دەبێتەوە،

www.alibapir.com



جگە لە سەرچاوەی زوڵاڵی وەحیی و شەریعەت، هیچ شتێکی دیکە، ناتوانێ تینووایەتیی هەموو مسوڵمانان بشکێنێ!

بۆیە هەڵسانەوەی مسوڵمانان و چاکبوونەوەی ئۆممەت: بەبێ بووژاندنەوەی ئیسلامی بەرجەستە لە وەحیی خوادا، بە هۆی چاك لێ تێگەیشتنەوەی مسوڵمانان بۆی و، باش تێدا پێگەیشتنەوەی، لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییان دا، مەحاڵەو، هەر کەسێك لە جگە لەو ڕێیەوە، بیر لە چاککردنی حاڵی مسوڵمانان بکاتەوە، خەیاڵ پڵاو دەکات و، هیچ بە هیچ ناکات.

٦/ رجب / ١٤٤١ ك

٢٠٢٠/٣/١ ز

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی

www.alibapir.com





## پێشەكی ئەم كتێبە

**الحمد لله الصلاة والسلام على رسول الله، محمد وآله المهتدين بهداه، من الصَّحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان إلى يوم لقاء الله.**

**بەڕێزان!**

حاڵی شپرزو واقیعی سەخت و دژواری ئۆممەتی ئیسلام، لەكەس شێردراوەو پەنهان نیەو، هەرچەندە بارودۆخ و هەل و مەرجی ناسك و هەستیار، لەمێژووی ئیسلام و مسوڵمانان دا زۆر گوزەراون و، گەلێك حاڵەتی سەخت و ناڕەحەت بەسەر ئەهلی ئیسلامدا هاتوون، بەڵام لەهەندێك ڕووەوە: قۆناغی ئێستای ئۆممەت لەناخۆشیی و خراپیی دا، ژمارەی پێوانەیی (الرقم القياسي) شكاندوە، بەتایبەت لە سێ ڕووەوە:



یەكەم: ناتەبایی و پەرتەوازەیی نێوخۆی ئۆممەت، كە چ لەڕووی فیكرییەوەو، چ لەڕووی سیاسییەوە، ئۆممەتی ئیسلام، زۆر خراپ پرژاوەو، مسوڵمانان لەزۆربەی وڵاتەكانیاندا، وەك دەنكەكانی تەسبیحێكی دەزوو پچڕاو، پرژو بڵاوبوونەوەو، لەحاڵێك دا كە خوای بەرزومەزن یەك ناوی لێناون:

﴿... هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴿٧٨﴾﴾ الحج.

مسوڵمانان ئێستا زۆربەیان ئەو تاكە ناوە خواییەیان فەرامۆش كردوەو، بوونە چەندان كۆمەڵ و گرووپی گەورەو گچكەو، خۆیان

www.alibapir.com



لەژێر چەندان ناوونیشان دا دەبیننەوەو، کێشەی گەورەش ئەوەیە کە دەمارگیرییەکی سەخت و خەستیشیان، بۆئەو جوغزوبازنەو ناوونیشانانەیان هەیە، کە هەڵقولاوی بیروزەینی خۆیان و، هەل و مەرجەکانی خۆیانن و، خواو پێغەمبەرەکەی (محمد)صلی الله علیه وسلم کەسیان پێیانەوە پابەند (مُلْزَم)نەکردوون.

**دووەم:** دواکەوتووێتیی ئۆممەت لەڕووی عەقڵیی و فیکریی و زانستییەوە، کە بێگومان ئەو دواکەوتوویيە زۆر دەرهاویشتەی خراپی نمایان و بەرجەستەی هەن، لەهەموو بوارەکانی دین و ژینی مسوڵمانان دا.

زەقترین حاڵەتی دواکەوتوویی عەقڵیی و فیکرییش، لەچاك تێنەگەیشتنی مسوڵمانان لەقورئان و ڕێبازی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم نمایانە، واتە: کتێبی خوێنراوی خوا (کتاب الله المقروء)،


٣٦


هەروەها زەقترین حاڵەتی دواکەوتوویی زانستییش، لە دووریی مسوڵمانان لە باش ئاشنا نەبوونیان بەگەردوون دا، بەرجەستەیە، واتە: کتێبی بینراوی خوا (کتاب الله المنظور).

**سێیەم:** بێهێزوپێزیی لەڕووی سیاسیی و ئابووریی و ئیداریی و سەربازییەوە، کە ئەمیش هێندە زەق و بەرچاوە، حەوجێی بەڕوونکردنەوەو قسە لەسەرکردن ناکات، چونکە وڵاتانی مسوڵماننشین، وەك گۆشتی خێرێ بەسەر زلهێزانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا بەشکراون!

ئنجا لەسۆنگەی ئەوەوە کە هەرمسوڵمانێك — بەگوێرەی تواناو بۆ لوانی- لەسەری پێویستە، خەم بخوات لەئایینەکەی و، ئەو ئۆممەتەش، کەلەسەری بنیات نراوە، کە لەو واقیع و حاڵەتە شپرزو دژوارە دەربازیان بکات، ئەگەر تەنانەت بەقسەیەکی هەق و، نزایەکی

www.alibapir.com



خێریش بووە، منیش بەپێویستم زانی لەو بارەوە بدوێم و ئەوەی بەهەق و ڕاست و، بەباش و سوود بەخشی دەزانم، لەوبارەوە بیخەمە ڕوو، هەروەك لە ڕابردووش دا، بەپێی توانام، ئەوەپێشەم بووە، ئیدی سەرەنجام: ئەم کتێبە بەرهەم هات کە لەئەسڵ دا دوو وتار بوون، لەکۆڕێك دا پێشکەش کراون.

**لێرەدا بەپێویستی دەزانم، ئاماژە بەڕاستییەکی گرنگ بکەم:**

بەڕای بەندە: ڕووباری ئیسلام هەرلەو ڕۆژەوە کە لەسەردەستی موبارەکی پێغەمبەری کۆتایی(محمد)صلی الله علیه وسلم لەسەرچاوەی زوڵاڵی وەحیی خواوە - کە لەقوڕئان و ڕێبازی پێغەمبەردا خۆی دەنوێنێ- کەوتەڕێ، بەردەوام ئەو ئاوە شیرین و سازگارو زوڵاڵەی وەحیی، لیتەو لاڵ و خشپ و خاڵ و، شتی نامۆی جۆراوجۆری تێکەڵ بووە، کە بەتەواویی: تام و بۆن و دیمەنی شێواندوە، بۆیە لەهەر کات و شوێنێك دا بویسترێ: گۆڕانکاریی و پاکسازیی و چاکسازیی لەژیانی مسوڵمانان دا بکرێ، لەهەردووك بواری دینداریی و دنیاداریی دا، پێویستە دەستپێك بریتی بێ لە: گەڕانەوە، بۆسەرچاوەی سازگارو زوڵاڵی وەحیی و پەیامی خوا سبحانەوتعالی.





هەڵبەتە سەرجەم ئەو مەزهەب و ڕێبازو قوتابخانە، فیقهیی و پەروەردەیی و فیکریی و عەقیدەییانەی، لەلایەن زاناو پێشەوایانەوەش، بەرهەم هێنراون، بەئەندازەی خزمەتیان بەمسوڵمانان و، لەمەحەکی نەقڵ و عەقڵ دەرچوونیان، جێی ڕێزو حورمەتن و، خاوەنەکانیان، بەئەندازەی ئیخلاص و پێکان (إصابة)یان، پاداشتیان لەلای خوای

www.alibapir.com



میهرەبان و بەخشەرهەیەو، ئێمەش سوپاسیان دەكەین و، دوعای خێریان بۆدەكەین، بەڵام:

هەقی ڕەها (الحق المطلق)تەنیا لەوەحیی خوا دایە: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ﴿٢٩﴾ ﴾ الكهف

هەروەها تەنیا پێغەمبەری خوا (محمد)صلی الله علیه وسلم لەهەڵەو پەڵە پارێزراو (معصوم)ە، بۆیە: دەمارگیریی (تَعَصُّب)و تەسلیم بوونی ڕەها، بۆهەر مەزهەب و ڕێبازو قوتابخانەو ئیجتیهادو بۆچوون و ڕایەك و، لەجێی وەحیی خوا دانانی و، كردنی بە جێگرەوە (بدیل)و ئەلتەرناتیڤی، هەڵەیەكی كوشندەیەو، ماك و سەرچاوەی زۆربەی لادان (إنحراف)ەكانە، لەڕێبازی شەریعەت، كە بەداخەوە ئەو حاڵەتی دۆگمایی و داخراویی و دەمارگیریی (جمود وإنغلاق و تَعَصُّب)ە، لەهەرسێك ڕەوتی: شیعەگەرایی[1] و، سۆفییگەریی[2] و،





---

(١) شیعەگەریی (تشیُّع) لەڕیشەدا جووڵانەوەیەك بوو، وەك لایەنگریی (علي بن أبي طالب) خوا لێی ڕازی بێ و، دواتر لەسەركردنەوەی خزمان و بنەماڵە (أهل البیت)ی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەتایبەت (علي)و كوڕو نەوەكانی، لەبەرانبەر ئومەوییەكان و عەبباسییەكان دا، كە ستەمی زۆریان لێ دەكردن، بەڵام دوایی دەستی پیسی كەوتە نێوو بەلاڕێدا برا، بەتایبەت دوای ئەوەی پەڕیەوە بۆوڵاتی فارس.

لەكتێبی سێیەمی مەوسووعەی: (بیركردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیع)دا، بەناوونیشانی: (تەوژمە فیكرییەكانی مێژووی مسوڵمانان) بەدرێژی باسی شیعەگەریی و گرووپەكانی و بیروڕایەكانیمان كردوە.

(٢) سۆفیگەریی (تصوُّف) لەئەسڵ دا، هەوڵێكی ژمارەیەك لەزانایان بووە، لەكاردانەوەی ڕۆچوونی كۆمەڵگا بەگشتی و، بەتایبەت حوكمڕانان، بەژیانی ماددیی و ڕابواردنی ناشەرعیی دا، بۆگێڕانەوەی كۆمەڵگا بەرەو لایەنی

www.alibapir.com





سەلەفییگەریی وەهھابیی[1] (السّلفية : الوهابية)دا، زۆرترین پشك و بەشی هەیە!

---

مەعنەویی و ڕووحیی و، وەدەستهێنانی تەزكییەی نەفس وتەقوا، بەڵام دوایی پاش سەرهەڵدانی ڕێبازەكانی سۆفیگەریی(طرق التصوُّف) لەزۆر لەوڵاتانی مسوڵمانان دا، كەم و زۆر لادان و هەڵەوپەڵەی تێكەوت و، هەندێك جاریش كەسانێكی ساختەو بەرژەوەندیی دنیایی خواز، خۆیان تێخزاندو، زیانی زۆریان بەناووشۆرەت و سومعەی گەیاندو، لەبەرچاوی خەڵكێكی زۆریان بێزراندو، لە ئامانجی بنەڕەتیی خۆی دووریان خستەوە.

لە كتێبی سێیەمی: (مەوسووعەی بیركردنەوەی ئیسلامیی...)دا بەناوونیشانی: (تەوژمە فیكرییەكانی مێژووی مسوڵمانان)، هەروەها لەكتێبی پێنجەمی دا، بەناوونیشانی: (چەند پرسێكی هەنووكەیی جۆراوجۆر)تا ڕاددەیەكی باش باسی: تەزكیەی نەفس و ڕێبازەكانی تەصەووفمان كردووە، هەوڵمان داوە: هەق و ناهەق، لەیەك هەڵاوێرین و جیایان بكەینەوە



(١) سەلەفییگەریی وەهھابیی (السّلفية الوهابية) جیایە لە ڕەوتی: شوێنكەوتنی پێشینی چاك (إتباع السّلَف الصالح)، كە ئەوە: خاڵی هاوبەشی نێوان سەرجەم مسوڵمانانەو، تایبەت نیە بەچەند كۆمەڵ و گرووپێكەوە، كە ئەو ناوونیشانە بۆخۆیان بەكاردێنن، مەبەست لە: سەلەفییگەریی وەهھابیی (السّلفية الوهابية) ئەو تەوژمەیە كە دەمارگیرانەو داخراوانە، ئەو ناوونیشانە بەناهەق بۆیان بەكاردێنن و، دەیانەوێ قۆرخی بكەن بۆخۆیان و، سەرئەنجام خۆیان لە جەماوەری مسوڵمانان دادەبڕن و، بەهۆی ئەو ناو لەخۆنانەشیانەوە، گیرۆدەی نەخۆشیی خۆپەسەندیی و، خۆبەسەر خەڵكدا هەڵكێشان و، موزایەدەی جۆراوجۆر دەبن.

لەهەركام لە كتێبی سێیەم و پێنجەمی: (مەوسووعەی بیركردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیع دا)بەناوەكانی: (تەوژمە فیكرییەكانی مێژووی مسوڵمانان) و (چەند پرسێكی هەنووكەیی جۆراوجۆر)دا، تاڕاددەیەك باسی هەركام لە ڕەوتی: شوێنكەوتنی پێشینی چاك و، تەوژمی سەلەفییگەریی وەهھابیی كراوە، لەكتێبی دووەمی مەوسووعەی ناوبراویشدا، بەناوونیشانی: (هێڵە گشتییەكانی جەماوەری مسوڵمانان) باسی هەڵەو ئیشكالەكانی ناوی (سەلەفیی) لەخۆنان، كراوە.

www.alibapir.com


هەرچەندە ئینساف و دادگەریی خوازیاری ئەوەیە کە بۆ هەڵسەنگاندن (تقییم)ی هەرکەسێك لە مسوڵمانان، سەرنجی خودی خۆی بدرێ و، بەهۆی ناوونیشانی طائیفەو مەزهەب و مەشرەب و حیزبەکەیەوە، نە ستەمی بۆ بکرێ و، نە ستەمیشی لێبکرێ و، بێگومان هەم لەنێو ئەوانەدا، کە بە ئەهلی طەریقەت و تەصەووف ناسراون و، هەم لەنێو ئەوانەشدا کە ناوونیشانی سەلەفیی، یان (وهابي)یان لەسەر بووە، کەسانی دیندارو ساغ و ڕاست زۆر بوون، کە خزمەتی گەورەو بەرچاویان بە ئیسلام و مسوڵمانان کردوەو، ئێمەش شانازییان پێوەدەکەین و، دوعای خێریان بۆ دەکەین، بەڵام کەسانێکی زۆریش لەژێر ئەو ناوونیشانانەدا — هەروەها لەژێر ناوونیشانی دیکەشدا— وەك زۆرێك لە لایەن و جم و جۆڵە ئیسلامییەکان - گیرۆدەی دەردی دەمارگیریی و خۆپەسندیی و داخراویی بوون. ٤٠

هەڵبەتە چاکەکانی نێو هەر کۆمەڵ و گرووپێك، چاکن و، خراپەکانیشیان خراپن.

کۆتایی ئەم (پێشەکی)یەش بەچەند قسەیەکی زانای ناودار (ابن عثیمین) خوا لێی خۆشبێ دێنم: کە لە وەڵامی پرسیاری: سەلەفییەت چییە (ما السلفية؟)دا گوتوویەتی: (السلفيّة هي اتباع منهج النبي صلى الله عليه وسلم وأصحابه، لأنهم سَلَفُنا تقدّموا علينا، فاتِّباعهم هو السلفيّة، وأما آتِّخاذ السلفيّة كمنهج خاص ينفرد به الإنسانُ، ويضلِّلُ مَنْ خالفهم من المسلمين ولو كانوا على حقٍّ، فلا شكَّ أَن هذا خلاف السلفية .... فالسلفيّة بمعنى أَن تكون حزباً خاصّاً، له مُميِّزاته، ويُضَلِّلُ أَفرادُهُ مَن سِواهم، فهؤلاء ليسوا من السلفيية في شيء)[٢].

---

(٢)(-) منهج الأئمة في التعامل مع المخالف، سراج الدين اليماني، ٢٦٥،٢٦٦.

www.alibapir.com





واتە: سەلەفییەت[1] شوێنکەوتنی ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانیەتی، چونکە ئەوان پێشینمان بوون و پێشمان کەوتوون، بۆیە شوێنکەوتنیان، سەلەفییەتە، بەڵام ئەوە کە مرۆڤ سەلەفیی بوون بکاتە بەرنامەیەکی تایبەتی خۆی و مسوڵمانانی جیا لەخۆی بەگومڕا دابنێ، هەرچەندە لەسەر هەقیش بن! ئەوە بێگومان پێچەوانەی سەلەفییەتە...

چونکە سەلەفییەت بەو واتایە کە حیزب و کۆمەڵێکی تایبەت پێك بهێنێ، کە چەند تایبەتمەندییەکی سەربەخۆی هەبن و، تاکەکانی خەڵکی دیکەی جیا لەخۆیان، بە گومڕا دابنێن، ئەوانە هیچ پەیوەندییان بەسەلەفییەتەوە نیە.



41



خوا بە لوطف و کەڕەمی بێ سنووری، هاوکارو هیداتدەرمان بێ، بۆزاڵبوونمان بەسەر ئارەزووەکانی نەفسمان و، کۆسپ و پەرچەکانی ڕێی گەڕانەوەمان دا، بەرەو سەرچاوەی زوڵاڵی وەحیی خوا، لەهەردووك بواری تێگەیشتن و پێگەیشتن، یان: زانین و توانین، یان: حاڵیبوون و لەخۆداکردنە حاڵ دا.

٦/ رجب / ١٤٤١ك

٢٠٢٠/٣/١ز

---

(١) (٥) کەواتە: ئەسڵ شوێنکەوتنی پێشینی چاك (السلف الصّالح)ە بە کردەوە نەك، بە ناولەخۆنان و شیعاری بێ کردار، بەو پێیەش بێ، زۆر (سەلەفیی ناو) لەسەلەفییەت دەشۆرێن!

www.alibapir.com





# ڕێ خۆشكردن

خوێنەری سەنگین و شیرین!

ئەم كتێبەی بەردەستت، لەئەسڵ دا كۆی دوو وتار (محاضرة)ی بەندە بوو، كە لە ئێوارەی ڕۆژی: (٢٠١٩/٢/١)زدا لە كۆڕێك دا[1] لە شاری ڕانیە، پێشكەش كراون، بەناوونیشانی: (واقیعی دژواری ئۆممەت: هۆكارو چارەسەر)، دەشتوانن لەكەناڵی تایبەتی خۆم لە یوتیوب، بەو بارکۆدە بینەری هەردوو وتارەكە ببن:



پاش تایپ كرانیان[2]و، دووسێ جار چاو پێداخشاندنەوەی وردی خۆم، بەمجۆرەیان لێهاتوە.

شایانی باسیشە: بابەتەكە بەهەرسێك تەوەرەكەیەوە، وەك خۆی هێڵراوەتەوە، جگە لەچەند وردە دەستكارییەك، كە شێوازی نووسین دەیانخوازێ، بەڵام چەند وردە بڕگەیەكیشم لەهەندێك شوێن دا زیاد كردوون، كە كەمیی كات، لەكاتی وتارەكان دا، ڕێگربووە لە خستنەڕوویان.

ئەمەش ناوونیشانەكانی باسەكانی ئەم كتێبە:

---

(١) كە لەلایەن ڕێكخراوی: (ئاراستەی دروست بۆ هزری هاوسەنگ)ەوە سازكرابوو، خوا پاداشتیان بداتەوەو زۆر سوپاسیان دەكەم.

(٢) لەلایەن كاك (شوان)ی كوڕمەوە، خوا پاداشتی بداتەوەو صاڵحتری بكات.

www.alibapir.com



دەستپێك: بەرچاوڕوونیی

تەوەری یەکەم: واقیعی دژواری ئۆممەت

تەوەری دووەم: هۆكار

١- نەشارەزایی و دواکەوتوویی عەقڵیی و زانستیی.
٢- پەرتەوازەیی و دووبەرەکیی.
٣- هەژاریی و نەداریی و، قڕیی و پڕیی و چینایەتیی.
٤- بێدەسەڵاتیی و وابەستەیی.
٥- ستەمکاریی و خۆسەپاندن.



بەرجەستەبوونی دوورکەوتنەوە لەوەحیی، لە حەوت دەرهاویشتەی سەرەکیی دا.

تەوەری سێیەم: چارەسەر

هەنگاوی یەکەم: خوێندنەوەی ڕاست و دروستی واقیع.

هەنگاوی دووەم: قەناعەت هەبوون بەگۆڕانگاریی و، هەبوونی ئیرادەی گۆڕانکاریی و پاکسازیی و چاکسازیی.

هەنگاوی سێیەم: گەڕانەوەی بۆ وەحیی خوا سبحانەوتعالى.

هەنگاوی چوارەم: قورئان کردنە پێوەرو تەرازووی گرنگییدان بەمەسەلەکان.

هەنگاوی پێنجەم: بیرکردنەوەو بەکارهێنانی عەقڵ و هەستەوەرەکان، لەتێفکرین و سەرنجدانی هەردووك کتێبی خوێندراوو بینراوی خوادا.

www.alibapir.com




هەنگاوی شەشەم: ژیان لەواقیع دا، نەك لەمێژوودا.

هەنگاوی حەوتەم: هاوسەنگ بوون و، خۆپاراستن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.

هیواشم وایە ئەم بەرهەمە کەلێنێکی باش بگرێت، لەبەرچاو ڕوونکردنەوەی بەشێکی زۆری مسوڵمانان دا، لەبارەی واقیع و حاڵی سەخت و دژواری ئۆممەت و، هۆکارەکانی پەیدابوونی ئەو واقیع و حاڵەتە نەویستراوەو، چۆنیەتی و هەنگاوەکانی گۆڕین و چارەسەرکردنیەوە.

هەروەها مایەی بەرچاو ڕوونیی و، ڕەواندنەوەی تەم و مژی گومان و دوودڵیی کەسانێکیش بێ، کە لە سۆنگەی نەشارەزاییانەوە، لە ئیسلامی بەرجەستە لە قورئان و ڕێبازی پێغەمبەری خاتەم (محمد)صلی الله علیه وسلم دا، حاڵی شپرزو شێواوی مسوڵمانان و ئۆممەت، دەکەنە بەڵگەی ناتەواویی ئایین و بەرنامەی کامڵ و تێرو تەواوی خوا (ئیسلام)!!

چونکە هەرکەسێك شارەزای قورئان و سوننەت بێ، دڵنیا دەبێ: کە هۆکاری بارودۆخی خراپ و شێواوی ئۆممەت: دوورییانە لە وەحیی و پەیامی خوای بەرزومەزنەوەو، تێدەگات کە: لەزۆربەی شتان دا، ئەوەی خواو پێغەمبەرەکەی (محمد) صلی الله علیه وسلم بەمسوڵمانانیان فەرمووە، فەرامۆشیان کردوە، بگرە بەپێچەوانەوە ش ڕەفتاریان کردوە!

www.alibapir.com





## دەستپێك: بەرچاوڕوونیی

بێگومان ئێمە چ وەك نەتەوەی کورد بە گشتی، لەم باشووری کوردستانەدا، هەروەها لە باکووری و، لە ڕۆژهەڵاتی و، لە ڕۆژئاوای، چ وەك ئەو نەتەوانەی کە بە هەموویان ئۆممەتی ئیسلام پێکدێنن، ئۆممەتی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)، لەسەرمان پێویست کراوە کە پابەند بین بە ئیسلامەوە، بۆ ئەوەی ناوی ئۆممەتی ئیسلام و ناوی مسوڵمانمان شایستە بێت، چونکە مسوڵمان کەسێکە بۆ خوا ملکەچە، بە هۆی پابەندیی بە ئایین و بەرنامەکەیەوە کە ئیسلامە، لە ڕاستییدا کەسێك ملکەچ نەبێ بۆ خوا و، پابەند نەبێ بە ئایین و بەرنامەکەیەوە، شایستەی ناوی مسوڵمانەتیی نیە، هەموو مسوڵمانێکیش لەسەری پێویستە لە زاتی خۆیدا، هەروەها بەکۆشیان: هەمیشە هەڵوەستە بکەن و خۆیان لەگەڵ ئیسلامدا پێوانە بکەن، بۆ ئەوەی بزانن لە کوێی ئیسلامن و ئەوەی کە ئیسلام فەرمانی پێ کردوە لە هەموو بوارەکاندا، چ وەك بووnناسیی، چ وەك ئیمان و عەقیدە، چ وەك پەرستشەکان، چ وەك ڕەوشت و ئاکارەکان، چ وەك لایەنی سیاسیی و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا و، چ لایەنی کۆمەڵایەتیی، چ لایەنی جەنگ و ئاشتیی و پەیوەندییەکان، دەبێت تەماشای خۆیان بکەن و بزانن لە کوێی ئیسلامەتیین؟ چونکە بەشەر ئەگەر هەر عەقڵی موجەڕڕەد بووایە، وەك فریشتەکان دەبوو، کە فریشتە خوای پەروەردگار وای خوڵقاندوون: بێ فەرمانیی خوا ناکەن و، غەریزە و نەفس و ئارەزووەکان کاریگەرییان لەسەریان نیە، بەڵکو تەنیا بەو ئیمان و خواناسیی (معرفة الله)یە کە خوا لەسەری ڕسکاندوون، بەڕێوە دەچن:







www.alibapir.com




﴿ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٦﴾ ﴾ التحريم.

بەڵام ئێمەی مرۆڤ، خوا وای دروست كردووین: دەتوانین بەرز بینەوەو، دەشتوانین داپەڕینە خوارێ، دەتوانین بگەینە (أعلى عليين) و دەشتوانین بچینەوە (أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ)، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (التين) دا دەفەرمویٚ:

﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ﴿٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٦﴾ ﴾ التين.

واتە: بەدڵنیایی مرۆڤمان لە باشترین شێوەدا (لەڕووی ماددیی و مەعنەوییەوە) دروست كردوە، دوایی (بەهۆی لەبیركردنی خوای خاوەنی و، ئامانج و حیكمەتی وەدیهێنرانییەوە) گێڕامانەوە بۆ پلەی ژێری ژێرەوە. بێجگە لەوانەی بڕوایان هێناوەو، چاكەكان ئەنجام دەدەن، ئەوانە پاداشتێكی نەبڕاوەیان هەیە.



**بەڕێـــزان!**

ئەم ئۆممەتی كۆتاییە، ئۆممەتی پێغەمبەری كۆتایی {محمد} (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر تەماشای قورئان بكەین، خوا لە سوورەتی (آل عمران)دا، ئاوای پێناسە دەكا، دەفەرموێ:

﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ [1] أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ۗ وَلَوْ ءَامَنَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم ۚ مِّنْهُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿١١٠﴾ ﴾ آل عمران.

---

(١)- بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن الكريم، راغب الأصفهاني، ص٨٦.

www.alibapir.com




وشەی (أمة) واتە: كۆمەڵ، كۆمەڵە خەڵكێك، كە لەسەر شتێك كۆبوونەوە،وەك: یەك ئاین، یەك كات، یان یەك شوێن....، خوا دەفەرموێ: ئێوە باشترین كۆمەڵن كە بۆ مرۆڤایەتیی ڕەخسێندراون، (لەبەر چی مسوڵمانان باشترین كۆمەڵە خەڵكن؟) چونكە فەرمان بە هەر چی شتی پەسندە دەكەن و، ڕێگریی لە هەرچی نا پەسندە دەكەن و، بڕواش بە خوا دێنن.

كەواتە: چاكتربوونی ئۆممەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە گۆترە نیە، هەر لەبەر ئەوەنیە كە پێیان دەگوترێ: مسوڵمان و، تەنیا هەر لەبەر ئەوە نیە كە دەڵێن: ئێمە كۆمەڵی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)ین، سەروەرو كۆتایی پێغەمبەران.





ئنجا بەڕێزان! زۆرجار ئەوە مرۆڤ بە هەڵەدا دەبات، بۆیە خوای زاناو شارەزا لە سوورەتی (النساء)دا، ئەو وەهمە دەپووچێنێتەوە، كە هەم ئەهلی ئیسلام پێیەوە گرفتار دەبن و، هەم خاوەن كتێبە پێشووەكانیش، كاتی خۆی و ئێستاش پێیەوە گرفتارن، دەفەرموێ:

﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾ ﴾ النساء.

واتە: بە خۆزگە خواستن و لاف لێدانی ئێوەو خاوەن كتێبەكان نیە: هەر كەسێك خراپە بكات، سزای دەدرێتەوە و، جگە لە خواش هیچ هاوكار و پشتیوانێكی چنگ ناكەوێ و، هەر كەسێك ئەهلی ئیمان

www.alibapir.com



بێ، لە نێر و مێ و، كردەوەی باش بكەن، بە پێی ئیمان و كردەوە باشەكانییان، پاداشتیان دەدرێتەوە و تۆزقاڵێكیش ستەمیان لێ ناكرێ.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم دوو ئایەتەش ئەوە بوو، كە مسوڵمانەكان دەیانگوت: ئێمە لە هەمووان چاكترین، جوولەكەكان دەیانگوت: ئێمە باشترین ئۆممەتین، نەصرانییەكانیش دەیانگوت: نەخێر ئێمە باشترین ئۆممەتین، تەفسیرەكان لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا دەڵێن: خوای پەروەردگار بەو بۆنەیەوە، ئەم دوو ئایەتەی دابەزاندنە سەر پێغەمبەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) [1].

ئنجا ئەوە تەنیا مسوڵمانان نین بە گشتی، كە زۆرجاران بە ناوی مسوڵمانەتیی هەڵدەخەڵەتێن، زۆر كەس كە ناوی مسوڵمانە پێی وایە لە خەڵكی دیكە چاكترە!



تۆ مسوڵمانی؟ بەڵێ! لەسەر ئیسلام حیسابی؟ بەڵێ! لەسەر پێغەمبەری كۆتایی حیسابی؟ بەڵێ! كەواتە: تۆ لە جوولەكە و نەصرانییەكان باشتری، لە مەجووسیی و بتپەرست و مولحیدان چاكتری!!، ئایا ئەوە ڕاستە؟! بە دڵنیاییەوە نەخێر! چونكە كاتێك مسوڵمان لە غەیری خۆی چاكترە، كە بە كردەوەو لە ناخەوەو، بەڕاستیی مسوڵمان بێ! نەك هەر ناوی مسوڵمان بێ، دەبێ بە نێوەڕۆك مسوڵمان بێ.

واتە: نەخێر! نە مسوڵمان لەبەر ئەوەی ناوی مسوڵمانە، لە خەڵكی دیكە چاكترە، نە جوولەكە لەبەر ئەوەی ناوی یەهوود بووەو،

-----------------------

(١)() المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص٣٢٦، و زاد المسير في علم التفسير لابن الجوزي، ص ٣٢٨، ٣٢٩.

www.alibapir.com





نە نەصرانیی لەبەر ناویان چاکتر بوونە. کەس لەبەر ناوی، لەوی دیکە چاکتر نیەو، کەسیش لەبەر ناوەکەی، خراپ نابێ، بەڵکو ئینسان بە کردەوە و نێوەڕۆك چاك دەبێ، یان خراپ دەبێ.

لە سوورەتی (البقرة)ش دا خوای پەروەردگار ئاوا پێناسەی ئۆممەتی پێغەمبەر (محمد) (صلى الله عليه وسلم) دەکا، دەفەرموێ:

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا ﴾ البقرة، ١٤٣.

واتە ئاوا بەو شێوەیە، {بەو شێوەیە کە باس کرا لە ئایەتەکانی پێشوودا}، ئێوەمان کردوە بە باشترین کۆمەڵ.

(وسط) واتە: ڕێك وهاوسەنگ (عَدْل)، وەك لە فەرمایشتی صەحیحی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە[1]، کە (وَسَطْ) واتە: هاوسەنگ، هەڵبەتە (وسط) لە ڕووی زمانەوانییەوە واتە: نێوەڕاست، ئنجا لەبەر ئەوەی زۆربەی جار وایە: ئەملا و ئەولای هەر شتێك خراپن و، نێوەڕاستەکەی باشە، بۆ وێنە:





١- (سەخاوەت و نانبدەیی و بەرچاوتێریی) لە نێوان دوو سیفەتی خراپ دایە، کە بریتین لە: (چەنگ قووچاندن و نەبەخشین و چرووکیی و ڕژدیی) و (دەستبڵاویی و ماڵی خۆ بەهەدەردان)، کە هەردووك لایان خراپن، بەڵام سەخاوەت ئەوەیە: نە دەست نووقاو بێ، نە دەست بڵاو بێ، وا بێ کە لە شوێنی خۆیدا ببەخشێ.

---

(١) الوَسَط: العَدْل، رواه احمد برقم: ١١٢٨٩، وقال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

www.alibapir.com



٢- هەروەها (ئازایەتیی) دەكەوێتە نێوان (ترسنۆكیی) كە سیفەتێكی خراپەو، خۆپێدادانی بێ حیساب كردن (تهوُّر) كە ئەویش هەر خراپە، ئازایەتیی ئەوەیە كە لە شوێنێكدا كە پێویست بكات، بچیە پێش و، كە پێویست نەكات، خۆت پەنهان بكەی و نەچیە پێش.

هەروەها بەم شێوەیە دەتوانین زۆر لە سیفەتەكان باس بكەین، كە ئەملاولایان سیفەتی خراپ و، نێوەڕاستەكەیان باشە، ئنجا ئایا ئۆممەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆچی كراوە بە باشترین كۆمەڵ، بۆچی باشترین كۆمەڵە؟ خوا دەفەرموێ:

﴿ لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾ البقرة، ١٤٣.

تاكو چاودێرین بەسەر مرۆڤایەتییەوە.

وشەی (النّاس) لە قورئاندا واتە: مرۆڤایەتیی و خەڵك بە گشتی، كەواتە ئۆممەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەك چۆن مولزەم كراوە كە لە زاتی خۆیدا مسوڵمانەتیی بكات و، لە وڵاتی خۆیدا مسوڵمانەتیی بەڕێوەبەرێ، وێڕای ئەوەش: پابەندكراوەو لەسەری پێویست كراوە، كە چاودێربێ بەسەر مرۆڤایەتییشەوە.

وشەی (شهداء)یش كە كۆی (شهید) یان (شاهد)ە، هەم بە مانای چاودێر دێ، هەم بە مانای گەواهییدەر (شایەدیی دەر) دێ، ئۆممەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەبێ هێندە چاك بێ، چاودێر بێ بەسەر مرۆڤایەتییەوەو، ئەگەر لە شوێنێك خەڵكێك لایدا، خراپەی كرد و زوڵمی كرد، ڕاستی بكاتەوە.

یاخود پێویستە بەڵگە بێت بەسەر مرۆڤایەتییەوە، كە ئایینی خوا، دوا نوسخەی هیدایەتی خوا، كە بە پێغەمبەری كۆتایی موحەممەد

www.alibapir.com





دا (صلى الله عليه وسلم) نێردراوە، باشترین ئایین و بەرنامەیە، ئۆممەتی پێغەمبەر دەبێ هێندە ڕاست و چاك بێ، بەڵگەی ڕاستیی و تەواویی ئایین و بەرنامەی خوا بێت بۆ مرۆڤایەتیی.

بۆیەش ئەوەم كردە دەستپێك، تاكو بزانین و دڵنیابین: كاتێك سەرنجی واقیعی دژواری ئۆممەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەدەین، ئەو بارودۆخە ناهەموار و نالەبار و پڕكێشە و دەرد و ئاشووبە، كە تێیدایە، ئەو واقیعە دژوارەی ئۆممەت، لەگەڵ ئەوەدا، كە خوا بۆی داناوە، زۆر لێك دوورن، ئۆممەت دەبێ باشترین كۆمەڵ بێت لەسەر زەوی و، دەبێت بەڵگەی ڕاستیی ئایین و بەرنامەی خوا بێت بۆ مرۆڤایەتیی و، دەبێت چاودێر بێ بەسەر مرۆڤایەتییەوەو، ئەگەر لایدا، ڕاستی بكاتەوە، كەچی ئێستا واقیعەكەی زۆر پێچەوانەی ئەوەیە!





لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
كەناڵی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
كوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com

 

بەڕێـــزان!

کاتێك سەرنجی واقیعی ئێستای ئۆممەت (ئۆممەتی ئیسلام) دەدەین، زۆر شت دەبینین، وەك هەڵەوپەڵە، بگرە لادان و تاوان، بەڵام من پێنج دیمەنم هێناون، کە زۆر نمایان و بەرجەستەن:

## یەکەم: نەشارەزایی و دواکەوتوویی

یەکێك لە زانایانی هاوچەرخ گوتوویەتی: (أمة إقرأ! لا تقرأ) {ئۆممەتی: بخوێنە، ناخوێنێتەوە}، ئەمە زەقترین و نمایانترین حاڵەتی نەخۆشییە لە ئۆممەتی پێغەمبەر (محمد)دا (صلی الله علیه وسلم) کە نەخوێندەوار و نەشارەزان، بە بەراورد لەگەڵ خەڵکی دیکەدا، هەڵبەتە بە گشتی قسە دەکەین و هاوکۆ (فُعَدَّل) لەبەرچاو دەگرین.





## دووەم: پەرتەوازەیی و دووبەرەکیی

لە حاڵێکدا - وەك دوایی باسی دەکەین- ئۆممەت لەسەری پێوست کراوە کە یەك ڕیز بێ، یەك دەنگ بێ، یەك ڕەنگ بێ، یەك سەنگ بێ، کەچی زۆربەی مسوڵمانان لەسەر ئاستی تاکەکان و حیزب و ڕێکخراوەکان و دەوڵەت و قەوارە سیاسییەکان، هەر کەسە لە ئاوازێك دەخوێنێ و، وەك پێشینان گوتوویانە: کەس لە مەڕی کەس ناخێوێ و، کەس بە ڕبەی کەس ناپێوێ و، هەر کەسە بە شیو و دۆڵێکدا دەڕوا! مسوڵمانان لەم ڕۆژگارەدا، هەزار و یەك ڕەنگ و دەنگ و، هەزار و یەك ناو و عینوانیان هەن.

www.alibapir.com





### سێیەم: هەژاریی ونەداریی و، قڕیی و پڕیی و چینایەتیی

لە لایەکەوە بەشێکی زۆری ئۆممەت لە تێکڕای وڵاتان مسوڵمانانیش دا هەژار و نەدارە، کەچی هەندێکیش زۆر لەسەریانەوە ڕژاوە! واتە هەم حاڵەتی قڕیی هەیە کە زۆرینەکەیە، هەم حاڵەتی پڕیی هەیە کە کەمینەیەو، چینایەتییەکی زۆر خراپ هەیە، لە جیهانی ئیسلامیی دا.

### چوارەم: بێ دەسەڵاتیی و وابەستەیی

ئایا ئێستا کام لە دەوڵەتانی ئیسلامیی توانایەکی وای هەیە: بتوانێ بەرگریی لە خۆی بکات، چ جای بەرگریی لە چەوساوانی دنیا بکات! ئۆممەتی پێغەمبەر صەڵات و سەلامی خوای لێبێ، ئەرکی سەر شانیەتی کە بەرگریی بکات لە هەر چەوساوەیەك لە هەر گۆشە و کەنارێکی دنیادا بێت، بە دەقی ئایەت، وەك خوای دادگەر لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ:

﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ﴾ النساء، ٧٥.

ئەم تەعبیرە: (وما لكم) واتە ئێوە چیتانە؟! ئەوە پێی دەگوترێ: {پرسیارکردنی نکوڵیلێکەرانە- الإستفهام الإنكاري}.

واتە: ئەوە چیتانە؟! بۆچی لە پێناوی خوادا و لە پێناوی چەوسێنراوانێکدا ناجەنگن، لە پیاوان و ئافرەتان و منداڵان کە دەڵێن:

www.alibapir.com





پەروەردگارمان! لەم وڵات و ئاوەدانییە کە خەڵکەکەی ستەمکارە، دەربازمانبکەو، لەلایەن خۆتەوە سەرپەرشتیار و دۆست و هاوکارێکمان بۆ بڕەخسێنە.

خوا گلەیی دەکات لە ئۆممەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە بۆچی لە پێناوی چەوساواندا خەبات ناکەن، کە ڕزگاریان بکەن و دەربازیان بکەن؟! کەچی ئێستا مسوڵمانان هەموویان بۆخۆیان چەوساوەن و، نەك بەرەی خەڵکیان پێ لە ئاوێ دەرنایە، بەڵکو بەرەی خۆشیان کەوتۆتە ئاوێ! ئنجا سەرنج بدەن! ئەوەی کە خوا لە ئێمەی ویستوە چۆنەو، ئەوەی ئێمە پێوەی گرفتارین چۆنە!!







## پێنجەم: ستەمکاریی و خۆ سەپاندان

ئێستا زوڵم و ستەمێکی زۆر هەیە لە نێو ئۆممەتی ئیسلامدا، لە لایەن حوکمڕانانەوەو، لەلایەن دەوڵەمەندەکانەوە، واتە: ئەوانەی کە دەستڕۆیشتوون، کە بە پارەی حەڕام و بە دەسەڵاتی ساختە و نا شەرعیی، خۆیان بەسەر خەڵك و وڵات (عباد وبلاد) دا سەپاندووەو، خێروبێرێك کە خوا بۆ هەموو مرۆڤەکانی ڕەخساندوە، بەبێ جیاوازیی، وەك فەرموویەتی:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴾ البقرة-٢٩.

واتە: ئەو (خوا) ئەو کەسەیە کە هەرچی لە زەویدایە بۆ هەمووتانی دروستکردوە.

ئەوان بۆ خۆیان و دەوروبەریان، لە حیزب و خزم و خەڵکی وابەستەو دابەستە، قۆرخیان کردوە!

www.alibapir.com





بەڕێـــــزان!

ئەمە واقیعەكەیەو، ویستم دیمەنێكتان بخەمە بەرچاو: كە {واقیعی دژواری ئۆممەت} یانی چی؟ هەڵبەتە من تەنیا لە پێنج بواردا ئەمەم خستە ڕوو، ئەگەرنا دەتوانین سەدان بوار بژمێرین، بەڵام پێم وایە ئەم پێنجە سەرەكییەكانیانن.







لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
كەناڵی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - كوردی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com





بەڕێـــــزان!

بە بۆچوون و تێگەیشتنی من: هەموو هۆكارەكان -هۆكارەكانی واقیعی خراپ و سەخت و دژواری ئۆممەت- دێنەوە نێو یەك هۆكار، ئەویش بریتیە لە دووركەوتنەوە لە وەحیی و پەیامی خوای پەروەردگار، وەحیی و پەیامی خواش، لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، ئنجا ئەمە هەویرێكە ئاوی زۆر دەوێ، كە: چۆن ئۆممەتی ئیسلام لە ئەنجامی دووركەوتنەوەدا لە وەحیی و پەیامی خوا و، لە قورئان و سوننەت، ئەو هەموو نەهامەتیی و ناهەمواریيانەی بەسەر هاتوون؟ بەڵام هەوڵ دەدەم: گوشراوی شتەكان و خولاسەكەیان و ڕووحەكەیان لە پێنج هۆكاری بنەڕەتیی دا، بخەمە ڕوو.







**هۆكاری یەكەم: نەشارەزایی و دواكەوتوویی فیكریی و زانستیی:**

**بەڕێـــــزان!**

یەكەمین حاڵەتی نەخۆشیی و ناخۆش لە ئۆممەتدا، بریتیە لە نەشارەزایی و دواكەوتوویی، نەشارەزایی و دواكەوتوویی لە: ڕووی زانستیی و فیكرییەوە، زیاتر مەبەستم ئەوەیە، چونكە مرۆڤ كە ئەهلی عیلم نەبوو و، عەقڵەكەی خۆی باش بەكار نەهێنا و، لە ڕووی فیكرییەوە دواكەوتوو بوو، لە هەموو ڕوویەكی دیكەشەوە، دواكەوتوو دەبێت، جیاوازیی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ چییە؟ بێگومان عەقڵە، ئنجا كاتێك مرۆڤ عەقڵی خۆی بەكار نەهێنا، جیاوازیی چیە لەگەڵ ئاژەڵ؟ خوای پەروەدگار دەفەرموێ:

www.alibapir.com





﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾ الاعراف، ١٧٩.

واتە: زۆرێك لە جنین و مرۆڤمان بۆ دۆزەخ ئامادە کردوون، (بۆچی خوای کاربەجێ بۆ ئەوێی داناون؟ لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەوەی مرۆڤی پێ لە ئاژەڵ جیادەکرێتەوە، لە کاریان خستوە، خواش مرۆڤی بۆیە دروست کردوە، کە مرۆڤ بێ، ئنجا کاتێك بە ویست و خواستی ئازادانەی خۆی، خۆی دەکاتە ئاژەڵ، شایستەی ئەوەیە سزا بدرێت، خوا ئاژەڵەکان ناباتە دۆزەخ، بەڵام مرۆڤەکان کە خۆیان دەکەن بە ئاژەڵ، دەباتە دۆزەخ! لە درێژەی ئایەتەکەدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ:) دڵیان {واتە عەقڵیان} هەن، بەڵام پێیان تێناگەن، چاویان هەن، بەڵام پێیان نابینن و، گوێیان هەن، بەڵام پێی نا بیستن.

{یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئەدی ئەوەنیە عەقڵیان بەکار دێنن؟ دەڵێین: بەڵێ، بەڵام ئەو عەقڵەیان بەکار ناهێنن بە شێوەیەك کە بۆ مرۆڤ پێویستە، کە ژیانێکی مرۆڤانەی پێ بڕەخسێنێ و دینداریی و دنیاداریيەکی باشی پێبکات، هەروەها دەبینن و دەشبیستن، بەڵام دیتن و بیستنێك نا کە تێگەیشتنی لەگەڵدابێ، دواتر دەفەرموێ:} ئەوانە وەك ئاژەڵن و لە ئاژەڵیش خراپترن، ئەوانە بێ ئاگان.

بۆچی لە ئاژەڵ خراپترن؟ چونکە ئاژەڵ ناتوانێ ئاژەڵ نەبێ، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ ئاژەڵ نەبێ.

ئنجا لە حاڵێکدا کە لە ڕووی فیکرییەوە ئۆممەت ئاوایە، با بزانین خوا لەوبارەوە چی فەرمووە؟

www.alibapir.com





یەكەمین ئایەتێك كە بۆ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) دابەزیوە، كە بۆخۆی نەخوێندەوار بووە، خوێندن و نووسینی نەبووە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُوا۟ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَـٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾ العنكبوت، ٤٨.

واتە: تۆ (ئەی موحەممەد!) پێش ئەم (قورئان)ە هیچ كتێبێكت نەخوێندۆتەوە، بەدەستی ڕاستیشت هیچت نەنووسیوە، ئەگەرنا ئەوانەی لەسەری ناهەقن، دەكەوتنە دوودڵییەوە.



پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نە خوێندنی هەبووە نە نووسینی هەبووە، هەروەها شارەزای كتێبە پێشووەكانیش نەبووە، چونكە وشەی (الأمي) دوو مانای هەن: یەكەم: نەشارەزا لە كتێبە پێشووەكان، دووەم: نەبوونی خوێندن و نووسین، بە هەردوو واتایەكە پێغەمبەر موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) (أمي) بووە، خەڵكەكەش زۆربەیان (أمي) بوون، بەڵام خوای پەروەردگار لە یەكەمین وشەی یەكەمین ئایەتدا، پێی دەفەرموێ: (إقرأ...) العلق-١- بخوێنە.

ئنجا با تەماشایەكی هەرچوار ئایەتی (٣٠، ٣١، ٣٢، ٣٣)ی (البقرة) بكەین:

﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَـٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ

www.alibapir.com

 

صَـٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُواْ سُبۡحَـٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ﴿٣٣﴾﴾ البقرة، ٣٠-٣٣.

واتە: یاد بكەوە! كاتێك پەروەردگارت بە فریشتانی فەرموو: (دەمەوێ) جێنشینێك لەسەر زەوی دابنێم، گوتیان: چۆن كەسێك لەوێ دا دادەنێی كە خراپەكاریی تێدا دەكات و خوێنرێژیی دەكات، لە حاڵێكدا كە ئێمە هەمیشە سەرگەرمی بەپاكگرتن و ستایشكردنتین و بەدوورت دەگرین (لە هەر لەكەو پەڵەیەك)؟!

(خوا) فەرمووی: ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن.

٦٤ { وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَـٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَـٰدِقِينَ ﴿٣١﴾} البقرة، ٣١.

ئنجا (خوا) هەموو ناوەكانی فێری ئادەم كردن، دوایی لەسەر فریشتەكان ڕاینواندن و فەرمووی: ئەگەر ڕاست دەكەن {ئێوە شایستەترن}، ناوی ئەوانەم پێ بڵێن.

{كە بێگومان ئەوانیش نەیانزانیون، چونكە خوا فریشتەكانی بۆ ژیانی سەر زەوی دروست نەكردوون، تاكو توانای ناو لە شت نانیان پێ بدات، فریشتەكان (مبرمج) كراون، وەك چۆن كۆمپیوتەر زانیاریی دەخرێتە نێو، بەس ئەوە كە خوا فێری كردوون، دەیزانن}

{ قَالُواْ سُبۡحَـٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ} البقرة، ٣٢.

(فریشتەكان) گوتیان: پاكیی بۆ تۆ، ئەوەی فێرت كردووین، بەس ئەوە دەزانین، بەدڵنیایی بەس تۆی زانای كارزان.

www.alibapir.com




بەڵام مرۆڤ دەتوانێ ئەوەش كە خوا فێری كردوە بیزانێ لە ڕێی پێغەمبەران و وەحییەوە، هەروەها دەتوانێ خۆیشی بەو توانایەی كە خوا پێی داوە، زۆر شت بزانێ.

ئنجا دوای ئەوەی كە ئادەم دەبێتە مامۆستای فریشتەكان، خوای پەروەردگار بە فریشتەكان دەفەرموێ: كڕنووشی بۆ بەرن:

{وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ...} البقرة، ٣٤.

یاد بكەوە كاتێك بە فریشتانمان فەرموو: كڕنووش بۆ ئادەم بەرن، یەكسەر كڕنووشیان برد.





ئەمە یانی چی؟ یانی: ئەوەی وا دەكات مرۆڤ بتوانێ لەسەر زەوی جێنشینی خوا بێ، سەر زەوی ئاوەدان بكاتەوە، ئەمانەتی خوا هەڵبگرێ، ژیانێكی تەندروست و ڕێك و ڕاست بگوزەرێنێ، ئەوەیە كە ئەهلی عیلم بێت، هەر بۆیەش ئادەم دوای ئەوەی بوو بە مامۆستای فریشتەكان و عیلمێكی لەلابوو، فریشتەكان لەلایان نەبوو، ئنجا شایستەی ئەوەبوو كە فریشتەكان كڕنووشی بۆ بەرن، لە ڕاستییدا كاتێك مرۆڤ دەبێتە ئەهلی عیلم، ئەو دەستەمۆ كران و ڕامكرانەی كە یاسای خوایە لەهەموو گەردووندا، لێی بەهرەمەند دەبێ.

وەك خوا (عز وجل) فەرموویەتی: {وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾} الجاثیة، ١٣.

واتە: هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدایە (خوا) لەلایەن خۆیەوە بۆ ئێوەی دەستەمۆ كردوەو بۆی ملكەچ كردوون، بێگومان لەوەدا نیشانە هەن بۆ كەسانێك بیربكەنەوە.

www.alibapir.com





بەڵام کەی مرۆڤ لەوە بەهرەمەند دەبێ؟ بێگومان کە بیربکاتەوەو ڕامێنێ وسەرەنجام عیلمی هەبێ، چونکە ئەگەر زانیاری نەبێ بە یاسا گەردوونییەکان و درووستکراوەکان و نهێنییەکانیان، لێیان بەهرەمەند نابێ و، بەبێ بەکارهێنانی عەقڵ و هۆشیشی ناتوانێ زانیارو شارەزابێ.

**هۆکاری دووەم: پەرتەوازەیی و دووبەرەکیی:**

خوای پەروەردگار یەك ناوی لە مسوڵمانان ناوە: {هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ} الحج، ٧٨.

بەڵام تەماشا بکەن، ئێستا مسوڵمانان چەند ناویان هەن! ئنجا سەربارەش دەمارگیریشن بۆ ناوەکان! جارێ شیعە و سوننە {هەڵبەتە وشەی (أهل السنة) وەك ناوی مێژوویی، ئەگەر نا زۆرینەی مسوڵمانان پێموایە کە نابێ جگە لەو ناوەی کە خوا لێی ناون، ناوێکی دیکە بەکار بێنن، (مسلمین) مسوڵمانان} ئنجا هەر لە نێو بازنەی سوننەدا چەندان ناو، هەروەها لە نێو بازنەی شیعەدا چەندان ناو، کە مەبەستم پێی ئینتیمای تائیفیی و مەزهەبییە، ئنجا ئینتیمای حیزبیی، ئینتیمای نەتەوەیی، ئینتیمای جوگرافیی...هتد. یانی مسوڵمانان وا پرژاون، بە شەنە و سێلکەش کۆناکرێنەوە، لە حاڵێکدا کە خوا یەك ناوی بۆ داناون، لە سوورەتی (الحج)دا دەفەرموێ:

{هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِى هَٰذَا} الحج، ٧٨.

واتە: ئەو (خوا) ناوی لێناون مسوڵمانان لەمەوبەر و لەم (قورئان)ەشدا.

هەروەها لە دوو ئایەت لە قورئاندا خوای بەرزی مەزن ئەهلی ئیمان و ئیسلامی شوێنکەوتووی پێغەمبەرانی بە یەك کۆمەڵ (أمة) داناوە:

www.alibapir.com





١- لە سوورەتی (الأنبیاء)دا فەرموویەتی:

{ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ } الأنبیاء، ٩٢.

سەرەتا خوا (عز وجل) باسی ژمارەیەك لە پێغەمبەران دەكات، سەلامی خوایان لێبێ، یانی: ئێوە شوێنکەوتەی ئەو پێغەمبەرانەن، ئنجا فەرموویەتی: ئەو کۆمەڵەی ئێوە یەك کۆمەڵە، منیش پەروەردگارتانم، بەندایەتیی تەنیا بۆ من بکەن.

٢- لە سوورەتی (المؤمنون)دا، خوای بەخشندە دەفەرموێ:

{ وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱتَّقُونِ } المؤمنون، ٥٢.

لێرەشدا باسی ژمارەیەك لە پێغەمبەران دەكات، سەلامی خوایان لێبێ، ئنجا دەفەرموێ: ئەم کۆمەڵەی ئێوە، یەك کۆمەڵەو منیش پەروەردگارتانم، دەجا تەنیا پارێز لەمن بکەن.

مسوڵمانان خوا ئاوای پێ فەرموون! کەچی ئەوان پرژوبڵاون و، وایان لە خۆیان کردوە، کە بە هیچ شتێك کۆ نەکرێنەوە.

ئنجا نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو لە دوو ئایەتی قورئاندا، خوا هەڕەشەی زۆر قورس لە مسوڵمانان دەکا کە ئەگەر بێت و دینەکەیان بەشبەش بکەن و، هەر یەکەی بەشێکی بگرن، بەشەکانی دیکەی واز لێبێنن و، لە نێو خۆیاندا ببنە گرووپ و تاقمی جۆراوجۆر، ئەوە وەك موشریکەکانیان کردوە و، هیچ فڕیان بەسەر خوا و دینەکەیەوە نامێنێ، تەماشا بکەن!

www.alibapir.com





١- خوا لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ:

{إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍۚ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ} الأنعام، ١٥٩.

واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی ئایینی خۆیانیان بەش بەش کرد، {یەکێ تەنها لایەنی تەزکیەی گرتوە، یەکێ تەنیا لایەنی فکیریی و، یەکێ بەس لایەنی جەنگ و، یەکێ تەنیا لایەنی سیاسەت... هەر کامێکیشیان هی خۆی پێ ڕاستە}، تۆ هیچ پەیوەندییت پێیانەوە نیە، لێپرسینەوەیان عایدی خوایەو، دوایی هەواڵیان پێ دەدات، لەبارەی ئەوەوە کە دەیانکرد.

ئەمەش هەڕەشەیەکی زۆر گەورەیە!



٢- لە سوورەتی (الروم)یشدا، خوا دەفەرموێ:

{ وَلَا تَكُونُواْ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًاۖ كُلُّ حِزْبِۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾} الروم.

واتە: لە هاوبەش بۆ خوا دانەران مەبن، ئەوانەی ئایینەکەی خۆیان بەش بەش کرد و، بوونە تاقم تاقم و، هەر کۆمەڵە ئەوەی کە بۆخۆی لەسەریەتی، دڵی پێخۆشە.

یانی: هەر کەسە بە یاری خۆی هەڵا دەڵێ و، هیچیان دانی خێر بە هی ئەوەی دیکەدا ناهێنێ! بەڵێ، خوا ئاوای فەرمووە و ئاوا هەڕەشەی لێکردوون، کەچی مسوڵمان ئاوان! بۆیەش گوتمان: هۆکاری سەرەکیی نەهامەتیی ئۆممەت، بریتیە لە دوورکەوتنەوە لە وەحیی و پەیامی خوا، کە لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە.

www.alibapir.com




**هۆکاری سێیەم: هەژاریی و نەداریی و، قڕیی و پڕیی و چینایەتیی**

دیمەن و تابلۆیەکی دیکەی دزێو، کە نیشانەی نا هەمواریی و دژواریی بارودۆخی ئۆممەتە، بریتیە لە هەژاریی و نەداریی لەلایەکەوە، بە نسبەت زۆربەی ئۆممەت و، لە لایەکی دیکەشەوە کەمینەیەکی زۆر دەوڵەمەندی لەسەرەوە ڕژاوی زێدەڕۆییکار.

واتە: حاڵەتی: قڕێی و پڕیی و چینایەتیی.

ئنجا با سەرەتا باسی هەژاریی و نەداریی بکەین:

خوا لە چەندان ئایەتدا، فەرمان بە مسوڵمانان دەکا کە دەست بجووڵێنن، کەسابەت بکەن، لەسەر پێی خۆیان بوەستن و، خاوەنی ئیمکانیەتی خۆیان بن، بۆ وێنە:





١- {هُوَ ٱلَّذِی جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِی مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَیْهِ ٱلنُّشُورُ} الملك، ١٥.

واتە: (خوا) ئەو زاتەیە زەوی بۆ دەستەمۆ کردوون {بۆی ڕامکردوون} ئنجا بە کەلێن و قەدپاڵەکانیدا بڕۆن و لە ڕزقی خوا بخۆن، {واتە: دەبێ بە کەلێن و قەدپاڵەکانیدا بڕۆن، بە بەرزیی ونزمییەکانیدا بڕۆن، ئنجا ڕزقتان دەست دەکەوێ، بەڵام لە بیرتان نەچێ} تەنیا بۆ لای ویش دەچنەوە!

ئنجا ئایا ئەم فەرمانەی خوا: ئێستا مسوڵمانان جێبەجێی دەکەن، یان کافرەکان؟! کافرەکان دنیا دەپشکنن، بن زەوی، ژێر دەریاکان، دەچن بۆ هەوا و کوێ و کوێ، لە ڕاستییدا ئەوان ئەمەیان

www.alibapir.com



جێبەجێکردوە، کەچی دواییش کۆلکە عەلمانییەك دەڵێ: مسوڵمانان بەهۆی دینەکەیانەوە دواکەوتوون! ئایا دەزانی دینەکەیان چی پێ گوتوون و ئەوانیش چەندە بە پێچەوانەوە ڕەفتاریان کردوە؟

**٢- خوای پەروەردگار لە سوورەتی (لقمان)دا، بە ئەهلی ئیمان دەفەرموێ:**

{أَلَمْ تَرَوْاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً} لقمان، ٢٠.

واتە: ئایا سەرنج نادەن و نابینن! خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، بۆ ئێوەی دەستەمۆ کردوەو چاکە پەنهان و ئاشکرایەکانی بەسەر ئێوەدا ڕشتوون!





ئەمە ئەوە دەگەیەنێ: کە مرۆڤ دەبێ تەماعی هەبێ نەك هەر لە زەویدا، بەڵکو تەماعی هەبێ لە خڕۆکەکانی دیکەش دا و، لە کەهکەشانەکانیشدا، کە لێیان بەهرەمەند بێ! ڕەنگە کەسانێك هەبن، هەر کە دەگوترێ: ڕۆکێتێکیان هەڵداوە بۆ سەر مەرریخ و، دەیانەوێ فلان خڕۆکەی دیکەش بپشکنن، هەر لە خۆوە پێی قەڵس بن و، هەستیارییەك بیانگرێ!

وەك جارێك مامۆستایەکی دوازدە عیلم، خوا لێی خۆشبێ وەفاتی کردوە، باسی چوونە سەر مانگ دەکرا، منیش گوتم: ئاساییە مرۆڤ بچێتە سەر مانگ، خوا دەفەرموێ: هەرچی لە گەردووندا هەیە بۆم دەستەمۆ کردوون.

ئەویش گوتی: نەخێر ئەوە ڕاست نیە.

پرسیم ئاخر بۆچی؟

www.alibapir.com




گوتی: ئاخر ئەمڕۆ بڵێن: چووینە سەر مانگێ، سبەینێ دەڵێن: چووینە سەر ڕۆژێ.

گوتم: مامۆستا! ڕۆژ ملیۆنان پلەی فەهرەنهایت گەرمە، هەر شتێك لێی نزیك كەوێتەوە، دەیپڕووكێنێ!

گوتی: نا! دوایی دەڵێن: چووینە سەر ڕۆژێ.

گوتم: ئنجا چی دەبێ؟

گوتی: چۆن! ئاخر دوایی خوا كوێی بەدەستەوە دەمێنێ!؟

هەڵبەتە ئەو كاتە ساڵانی هەشتایەكان بوو، بەڵام شتێكم لە بارەی گەردووناسییەوە دەزانی.





گوتم: مامۆستا! ئەو كەهكەشانەی ئێمە یەكێكە لە ملیۆنان كەهكەشانی دیكە، شایانی باسە: ئێستا زانایان دەڵێن: دووسەد (٢٠٠) ملیار كەهكەشان لە گەردووندا هەیەو، هەندێك دەڵێن: یەك تریلیۆن واتە: هەزار ملیارو، ئەم كەهكەشانەی ئێمەش دەڵێن: یەك تریلیۆن (١،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) [١٢١] ئەستێرەی تێدایەو، خۆری ئێمە یەكێكە لە ئەستێرەكانی كەهكەشانی كاكێشان، واتە: یەكێكە لەو تریلیۆن ئەستێرەیە، موڵكی خوا زۆر زۆر فراوانە! ئنجا خوا دەفەرموێ: هەموویم بۆ دەستەمۆ و ڕامكردوون، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ: ئەی مرۆڤ! هەوڵبدە لێی بەهرەمەند بی، بە شێوەیەك لە شێوەكان، چونكە بۆ تۆ وای لێكراوە، كە بتوانی لێی بەهرەمەند بی.

هەروەها دەربارەی قڕیی و پڕیی و چینایەتییش، خوا بە دەقی ئایەت حەڕامی كردوە، كە لە نێو مسوڵماناندا قڕیی و پڕیی و

www.alibapir.com



چینایەتیی هەبێ، زۆربە قڕ بن و، هەندێك پڕ بن! بۆ وێنە: خوا لە سووڕەتی (الحشر)دا دەفەرموێ:

{ كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡ } الحشر، ٧.

باسی دابەش كردنی (فَيْء) دەكا دوایی دەفەرموێ: خوا بۆیە وا دابەشی كردوە، تاكو سەروەت و سامان، لە دەستی دەوڵەمەندەكانتاندا كورت هەڵنەیەت.

كەواتە: ئەوەی كە ئێستا دەیبینین، ئەو پێنج شەش ملیۆن خەڵكە لە هەرێمی كوردستاندا، خەڵكێكی كەمین، كەچی دەڵێن: چەندان ملیاردلێری تێدان، حاڵی زۆربەی خەڵكیش دەبینین چۆنە! ئەوە خۆی حاڵەتێكی ناشەرعییەو، ڕێك لەگەڵ ئایەتی خوادا تێك دەگیرێ.



لە صەحیحی بوخاریی و موسلیم دا هاتوە، كە ڕۆژێك كۆمەڵێك لە یەمەنەوە دێن بۆ خزمەت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ، خەڵكێك دەبن، زۆر هەژار و نەدار و بەرگ شڕ و برسیی و، ڕووت و ڕەجاڵ، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) كە تەماشایان دەكات، زۆر كارتێكراو دەبێ و ناڕەحەت دەبێ، دوایی دەفەرموێ: (مَنْ كَانَ مَعَهُ فَضْلَ ظَهرٍ، فَلْيَعُدْ بِهِ عَلى مَنْ لا ظَهْرَ لَهُ، وَمَن كانَ عندَهُ فَضْلَ زَادٍ، فَلْيَعُدْ بِهِ عَلَى مَن لا زَادَ لَه...)[1]

پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: كێ وڵاخی زیادی پێیە، با بیداتە ئەو كەسەی كە وڵاخی پێ نیەو، كێ خواردنی زیادی پێیە، با بیداتە ئەوانە كە خواردنیان پێ نیە.

-------------------

(١)() رواه البخاري:١١٣١١ ، ورواه مسلم: ١٧٢٨.

www.alibapir.com



گێڕەرەوە (راوي) دەڵێ: بەوجۆرە پێغەمبەری خوا هەموو جۆرەکانی ماڵ و سامانی باس کردن، هەتا ئێمە دڵنیا بووین، کە هیچ کام لە ئێمە بۆی نیە، شتی زیادی لەلا بێت و، لەو لاشەوە هەژارێك و نەدارێك و پەككەوتەیەك هەبێ.

پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم) بە کردەوە وای کردوە، ئەگەر خەڵکێك هەبێ بە تیۆریی باسی بکا!

هەروەها لە صەحیحی بوخاریی و موسلیم دا هاتوە دەربارەی زەکات، دەفەرموێ: (تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ)[1]، واتە: لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ و دەدرێتەوە بە هەژارەکان! کەچی ئێستا پێچەوانە کراوەتەوە: سەروەت و سامان لە فەقیران وەردەگیرێ و دەدرێتە دەوڵەمەندەکان! پێچەوانەی ئەوەی کە پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم) فەرموویەتی! کەواتە ڕاستە دوورکەوتنەوەمان لە وەحیی و پەیامی خوا، بەو دەردەی بردووین، لە ڕووی ئابووریی و ژیان و گوزەرانەوە.






---

(١)() رواه البخاري: ١٤٩٦ و ومسلم: ٢٥٨٣.

www.alibapir.com





## هۆكاری چوارەم: بێ دەسەڵاتیی و وابەستەیی :

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (المنافقون)دا، دەفەرمووێ:

{وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَا يَعۡلَمُونَ}المنافقون، ٨.

وشەی: (عزة) لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: {العزة هي الحالة التي تجعل صاحبها لا يُغلَبْ}[1]، واتە: عیززەت: ئەو حاڵەتەیە كە وا لە خاوەنەكەی دەكات، كەس بە سەریدا زاڵ نەبێ، یانی: باڵادەستیی. واتە: عیززەت هی خوایەو، هی پێغەمبەری خوایەو، هی بڕوادارانە.

هەروەها لە سوورەتی (الفاطر)دا دەفەرمووێ:

{ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ جَمِيعًاۚ إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥ } الفاطر، ١٠.



واتە: كێ باڵادەستیی و بەرزیی دەوێ، باڵادەستیی هەمووی لە لای خوایە، {چۆنی وەدەست بێنین؟} وشەی پاك و چاك { (الكلم الطيب) خوا بەیەكگرتن (توحيد) } بۆ لای وی (خوا) بەرزدەبێتەوە. {یانی: بەو وشەیە ئەو عیززەتە لە لای خواوە وەدەست دێ}، ئەو وشەیەش (ئەو تەوحیدەش) كردەوەی چاك بەرزی دەكاتەوە.

ئەگەر نا هەزار جار بڵێی: (لا اله الا الله)، ئەگەر لە ژیانتدا تەرجەمەی نەكەی بە كردەوە، لەلای خوا بایی پوولێكە! كەواتە: ئەگەر مسوڵمانان ئەهلی تەوحید بن، خواپەرستی بەڕاستی بن،

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، راغب الأصفهاني، ص٥٦٣، دار القلم، دار الشامية، ط٣، ٢٠٠٤م.

www.alibapir.com





خاوەنی عیززەت دەبن، ئەمە لە سەداسەد وایە! كێ لە بەرانبەر پارەی حەڕامی دەوڵەمەندێكدا خۆی دەدۆڕێنێ؟ كێ لە بەرانبەر دەسەڵاتی ساختەی ستەمكارێك و خۆسەپێنێكدا، خۆی بچووك دەنوێنێ؟ كەسێك كە ئەهلی ئیمان و تەوحید نەبێ، كەسێك كە پەیوەندیی بە خواوە نەبێ، تەماشابكەن خوشك و برایانی بەڕێز! جادووگەرەكان، كە فیرعەون هێنانی بۆ دژایەتیی كردنی مووسا، سەلامی خوا لەسەر مووسا و هاڕوونی برای بێ، پێش ئەوەی ببنە ئەهلی ئیمان و تەوحید، چییان دەگوت؟

{ وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرۡعَوۡنَ قَالُوٓاْ إِنَّ لَنَا لَأَجۡرًا إِن كُنَّا نَحۡنُ ٱلۡغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ نَعَمۡ وَإِنَّكُمۡ لَمِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ﴿١١٤﴾ } الأعراف.







واتە: جادووگەرەكان هاتنە لای فیرعەون گوتیان: ئایا كرێمان دەدەیە ئەگەر ئێمە زاڵ بووین؟ پاداشتمان دەدەیە؟ (فیرعەون) گوتی: بەڵێ! بەڵێ! زۆریش لە خۆمتان وەنزیك دەخەم!

پێش ئەوەی ئەهلی ئیمان بن، ئاوا بۆ تۆزە تەماعێك ماستاویان بۆ فیرعەون دەكرد، بەڵام دوای ئەوەی بوونە ئەهلی ئیمان، چییان لێهات؟ كودەتایان بەسەرداهات! گۆڕانكارییەكی سەدوهەشتا (١٨٠) پلەییان بەسەردا هات و بوونە كەسایەتییەكی دی و مرۆڤێكی دی، كە خاوەنی ئەوپەڕی عیززەت و ئازایەتیی و دەمار و ئازادیی بێ! كاتێك فیرعەون هەڕەشەیان لێدەكات، وەك لە سوورەتی (طه)دا هاتوە:

{فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمۡ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخۡلِ وَلَتَعۡلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابٗا وَأَبۡقَىٰ} طه، ٧١.

www.alibapir.com



واتە: (فیرعەون گوتی:) بەدڵنیایی دەستی ڕاست و پێی چەپتان دەبڕم و، بە گلۆفکی دار خورماوە هەڵتاندەواسم {بۆ ئەوەی بە ئەشکەنجەوە وردە وردە خوێنەکەتان تێدا نەمێنێ و بمرن}، ئنجا ئەوکاتە بۆتان دەردەکەوێ {من و مووسا} کامەمان سزایەکەمان توندترە!

ئەوان چییان گوت؟

{ قَالُواْ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا ۖ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ۖ إِنَّمَا تَقْضِى هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ} طه، ٧٢.

گوتیان هەرگیز تۆ هەڵنابژێرین، {بە هەرڕەشەتەوە، بە تەماعتەوە}، بەسەر ئەو بەڵگە ڕۆشنانەدا کە لە خواوە بۆمان هاتوون {بە مووسادا}، هەرچی لە دەستت دێ بیکە، چونکە هەرچی دەیکەی، لە چوارچێوەی ئەم ژیانە دنیاییەدا دەیکەی.



خۆشەویستەکانم! ئەگەر ئینسان بڕوای بە ڕۆژی دوایی بێ، نابێتە کۆیلەی ژیانی دنیا، هەر بۆیە (ربعي بن عامر) نوێنەری سوپای مسوڵمانان، کاتێ دەچێ بۆ لای (ڕۆستەم) فەرماندەی سوپای فارس، دەڵێ: بۆچی هاتوون؟ ئەویش لە وەڵامدا سێ شتان دەڵێ، تەماشا بکەن ئەوانە چەند چاك لە ئیسلام تێگەیشتوون! ئەگەر بە مسوڵمانێکی ئەم ڕۆژگارەی گوتبایە، بە مەلایەك، بە بانگخوازێك[1]، بە شێخێك، دەیگوت: وەرە با پێت بڵێم: شەش پایەی ئیمان و، پێنج پایەی ئیسلام، ئەوە یازدە (١١)، ئنجا ئەوەش لیستی حەڕام و حەڵاڵەکان! بەڵام ئەو هەموو ئیسلامی بۆ لە سێ وشەدا

---

(١) وشەی (بانگخواز)م بۆ (داعي) پێ هەڵەیە و ڕاست وایە بگوترێ: (بانگەوازکار)، بەڵام بۆیە بەکارم هێنا چونکە زۆر باوە.

www.alibapir.com




خولاسە دەكاتەوەو دەڵێ: (نحن قوم ابتعثنا الله لنخرج من شاء من عباده، من عبادة العباد إلى عبادة الله، ومن ضيق الدنيا إلى سعة الدنيا والآخرة، ومن جَوْر الأديان إلى عدل الإسلام).[1]

واتە: ئێمە كۆمەڵێكین، خوا ناردووینی، تاكو هەر كەسێك كە خوا بیەوێ، {هەموو شتێ دەبەستنەوە بە ویستی خواوە، دەنا مرۆڤەكان بە ویستی خۆیان مسوڵمان دەبن یان نابن، بەڵام وەك ئەدەب لەگەڵ خوادا، ئەگەر ئەو نەیەوێ، هیچ شتێك نابێ}، لە كۆیلایەتیی مرۆڤەكان دەری بێنین بۆ بەندایەتیی بۆ خوا. {كەی ئینسان ئازاد دەبێ و دەرباز دەبێ؟ كاتێك بەندەی خوا بێ، ئینسان تاكو نەبێتە بەندەی خوا، هەر لە كۆیلایەتییەكەوە بۆ كۆیلایەتییەكی دیكە دەڕوا!} هەروەها لە تەسكیی دنیا بۆ فراوانیی دنیا و قیامەت {دنیا زۆر بەرتەسكە، ئەگەر ژیان هەر ئەو شەست حەفتا ساڵە بێ، زۆر كەمە! بۆیە من گلەیی لە خەڵكی بێدین ناكەم، كە دەبێتە كۆیلە و خۆی دەفرۆشێ، لەو ڕووەوە گلەیی لێ ناكەم، كە تەنیا ژیانی دنیا شك دەبات، دەڵێ: هەرچۆنێك بێ، با ئەگەر بەسەرشۆڕیی و بە زەبوونییش بێ، چوار پارووی خۆشم دەستكەون! بەڵام بەڕاستیی مسوڵمانێك بڕوای بە ڕۆژی دوایی بێ، بۆ دوو هەناسە ژیانی دنیا و تۆزێك لەززەتی كاتیی، خۆی زەبوون و زەلیل بكات، بەڕاستیی زۆر بێ عەقڵە! ئەگەرنا بابای بێدین شتێكی مەنطیقیی دەكا، دەڵێ: هەر ئەم دنیایە شك دەبەم و، لە پشت ئەوەوە هیچی دیكە شك نابەم و، هەركات مردم، دەبمە بەردی بن گۆمێ و، هەموو شتێك لەدەست دەدەم}.



---

(١) تأريخ الأمم والملوك للطبري/ ج٢، ص١٠٧، ١٠٨، هەروەها بڕوانە: البداية والنهاية لابن كثير، ج٧، ص٤٩-٥٣، دیسان بڕوانە: الكامل في التأريخ لابن الأثير، ج٢، ص٤٦٣، ٤٦٤ .

www.alibapir.com



دوایی ربیعیی كوڕی عامیر دەڵێ: هەروەها دەربازیان بكەین لە ستەمی ڕێچكە و بەرنامەكان بۆ دادگەریی ئیسلام.

دادگەریی ڕەها تەنها لە بەرنامەی خوادا هەیە، لەبەر چی؟ چونكە ئیسلام ئایینی خوایەو، خواش ڕەگەزی نیە، بڵێین: نێرە یان مێیە، بۆیە پیاوسالاریی و ژن سالاریی لە دینی خوادا نیە، شەریعەت سالاریی هەیە، پاشان: خوا لایەنگیریی نیە بە لای دەوڵەمەنددا، یان بە لای هەژاردا، ئەگەر دەوڵەمەند لەسەر حەق بێ و،ماڵەكەی بە حەڵاڵی پەیدا كردبێ و، ڕەنجی دابێ، باشترە لە فەقیرێك كە بەهۆی تەمبەڵییەوە فەقیر بووە، خوای دادگەر، هەمیشە لایەنگیریی بەلای حەق دا هەیە. هەروەها، خوا نەتەوەیەكی نیە، تاكو لایەنگریی نەتەوەیەكی دیاریكراو بكات و، ڕەنگێكی نیە، تاكو بەلای ڕەنگێكدا دایشكێنێ! خوای پەروەردگار و بەدینهێنەری هەموو لایەكە، بۆیە ئایینەكەی دادگەریی ڕەهای تێدایە.





ئنجا سەبارەت بە وابەستەیی و سەر بەملاو بەولا بوون، ئێستا دەوڵەتێكی مسوڵماننشینت دەستناكەوێ، كە سەر بە لایەك نەبێ، ئەوانەش كە سەر بە لایەك نەبن، بەسەختیی دژایەتیی دەكرێن و ئابڵووقە دەدرێن، بەڵام خوا لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ:

{يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْكَـٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَـٰنًا مُّبِينًا} النساء، ١٤٤.

ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! كافرەكان لە جیاتی ئیمانداران مەكەنە دۆست و پشتیوانی خۆتان، ئایا دەتانەوێ بەڵگەیەكی ئاشكرا بۆ خوا لەسەر خۆتان پەیدا بكەن!!

www.alibapir.com





هەروەها لە سوورەتی (آل عمران)دا خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ:

{لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ} ال عمران، ٢٨.

واتە: بڕواداران نابیٚ کافران بکەنە دۆست و پشتیوانی خۆیان لە جیاتی ئیمانداران و، هەر کەسیٚك وابکات، هیچ پەیوەندیی بە خواوە نامیٚنیٚ! ناتوانیٚ بلٚیٚ من بەندەی خوام، لەولاشەوە: سەر بە دوژمنان و ناحەزانی خوا بیٚ، ئەگەر جوولەکەن ئەگەر نەصرانیین، ئەگەر ئەمریکایە، ئەگەر ڕووسیایە، ئەگەر شەرقە، ئەگەر غەربە، ئەهلی ئیمان دەبیٚ تەنیا دلٚی لەگەلٚ ئەهلی ئیماندا بپشکویٚ، دلٚی تەنیا بەوان خۆش بیٚ، هەلٚبەتە ئەوەش مانای وانیە کە هەرچی کافرە دژی بیٚ، بەلٚکو مسولٚمان لەگەلٚ هەرچی مرۆڤە لەسەر ئەم زەوییە، دەبیٚ چاکە بکات و، دادگەر بیٚ، جگە لەوانەی کە چاویان لە زولٚم و خۆسەپاندن و قۆرخکارییە و، چاویان لە بردنی خیٚر و بیٚری ولاٚتانی مسولٚمانانە بە تالاٚن.







لە تۆڕە کۆمەلاٚیەتییەکان لەگەلٚتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com





## هۆکاری پێنجەم: ستەمکاریی و خۆ سەپاندن

دیمەنی ستەمکاریی و خۆسەپاندن لە نێو ئۆممەتدا زۆر زەقەو، بە دەگمەن وڵاتێکت دەست دەکەویٚ وەك خوا فەرموویەتی: کاروباریان بە ڕاویٚژ لەبەینیاندا: (أمرهم شورى بينهم) الشورى-٣٨-، کرابێتە بناغە، کە لە ئیسلامدا بەس ئەوە بناغەی حوکمڕانییە، لە ئیسلامدا دەسەڵات هی خەڵکەو، خوا لە هەموو دواندنەکانیدا، ڕووی لە خەڵکە: {يا أيها الناس ، يا بني آدم، يا أيها الإنسان، يا أيها الذين آمنوا}، یەك جاریش خوا نەیفەرمووە: {يا أيها العلماء}، یان {يا أيها المشايخ، يا أيها المسؤولون}، دەسەڵات هی خەڵکەو، کاتێك وڵاتێك بە باشیی ئیدارە دەکرێت، کە خەڵك خۆیان شەریعەتی خوا بەسەر خۆیاندا پیادەبکەن، بەرپرسانی خۆیان دابنێن، لێپرسینەوەیان لەگەڵ دا بکەن و، چاودێرییان بکەن و، کاتێك کە ڕاست نەبوونەوە، لاشیان بدەن. ئەمە حاڵەتی تەندروستە، ئیدی کە دوایی خەڵك دیٚ ئا ئەوەی گوتمان بە ناوی (دیموکڕاسیی) یەوە بە ئێمەی دەفرۆشیٚ، ڕاست نیە، چونکە کاکڵ و جەوهەری دیموکڕاسیی زۆر کۆنترە لەوەی کە لە یۆنان هەبووە، من لە هەندێك لە کتێبەکانمدا باسم کردوە: کە خوای پەروەردگار هەموو مرۆڤەکان عەقڵ و فیترەتێکی پێداون، دەزانن کە دەسەڵات و سامان، ئەگەر هی خەڵك بن بەگشتی، {کە هی خەڵکن لە ئەسڵدا}، حاڵەتی کۆمەڵگا تەندروستتر دەبیٚ، بۆیە خوا وشەی دەستاودەستکردن (مداولة)ی لە قوڕئاندا، بۆ ئەم دووە بەکار هێناوە:

أ- بە نسبەت دەسەڵاتەوە، دەفەرمویٚ: {وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ} ال عمران، ١٤٠.

www.alibapir.com




واتە: ئەم ڕۆژانە دەستاودەست پێ دەکەین لەنێو خەڵکدا.

ئەمە ئەوەیە کە ئێستا پێی دەگوترێ: دەستاودەستکردنی دەسەڵات.

ب- بە نسبەت سامانیشەوە، دەفەرموێ: {كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡۚ} الحشر، ٧.

واتە: بۆ ئەوەی (سامان) تەنیا لە دەستی دەوڵەمەندەکانتاندا نەبێ، بەڵکو، بگەڕێ و گەردش بکا و قۆرخ نەکرێ.

ئێستاش با لەبارەی ستەمی سیاسی و خۆسەپاندنەوە، سەرنجی چەند ئایەتێك بدەین:



١) تەماشا بکەن! خوا لە بارەی ستەمەوە چی دەفەرموێ لە سووڕەتی (هود)دا: {أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ} هود، ١٨.





واتە: ئاگادار بن! نەفرینی خوا لە ستەمکاران.

ئنجا ئەوەتان لە بیر بێ، دوایی پێتان دەڵێم: کە ئەوە چی لەسەر بنیات دەنرێ؟

٢) لە سووڕەتی (البقرة)شدا خوا دەفەرموێ: {لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ} البقرة، ١٢٤.

واتە: ستەمکاران پەیمانی من نایانگرێتەوە {کە ببنە پێشەواو حوکمڕان}.

کاتێك خوا ئەوەی فەرموو، کە ئیبراهیم سەلامی خوا لێبێ، خوا کردی بە پێشەوای مرۆڤایەتیی، ئەویش داوای کرد لە وەچەکەیشیدا پێشەوایەتیی بەردەوام بێ:

www.alibapir.com





{وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَـٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّـٰلِمِينَ } البقرة، ١٢٤.

واتە: یادبکەوە! کاتێك ئیبراهیم پەروەردگاری بە چەند وشە (ئەرك)ێك تاقیکردەوە، ئەویش تەواوی کردن، (خوا) فەرمووی: دەتکەمە پێشەوا بۆ خەڵك، پرسی: ئەدی لە وەچەکەم {ئەوانیش دەکەی بە پێشەوا} ؟ (خوا) فەرمووی: ئەوەی ستەمکار بێت پەیمانی من نایگرێتەوە.

٣) لە سوورەتی (الشوری)دا، خوا دیاریی کردوە کە دەبێ کاروباری کۆمەڵگا و وڵات بەراوێژ بەرێوەببرێ، وشەی (أمر) لە قورئاندا بۆ زانیاریتان واتە: کاروباری سیاسیی بە پلەی یەکەم، ئنجا خوا (شوری) ی کردۆتە بناغەی کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمان و فەرموویەتی:



{وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ} شوری، ٣٨.

٤) خوا لە قورئاندا زۆر زەمی فیرعەون دەکات و، بەسەرهاتێك، کە لەنێو بەسەرهاتەکاندا زۆرترین پانتایی قورئانی داگرتبێ، بەسەرهاتی مووسا و هاروونی برایەتی، سەلامی خوایان لێبێ، لەگەڵ فیرعەون و قاروون و هاماندا، ئەم سێ کوچکەیە، لە سوورەتی (القصص)دا خوا دەفەرموێ:

{ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ } القصص، ٤.

واتە: فیرعەون لە زەویدا خۆی بەرز کردەوە، {واتە: ملهووڕیی کرد}، خەڵکەکەشی بەشبەش کرد، {تێکی بەردان}، هەندێکی دەچەوساندنەوە:

www.alibapir.com





نێرینەكانی سەردەبڕین و مێینەكانی دەهێشتنەوە، بەڕاستیی ئەو لە تێكدەران و خراپەكاران بوو.

بۆچی خوا دەفەرموێ: لەعنەتی خوا لە زاڵمان؟ هەروەها دەفەرموێ: پەیمانی من زاڵمان ناگرێتەوە؟ هەروەها دەفەرموێ: كاروباری مسوڵمانان دەبێ بە ڕاوێژ بێ؟ ئنجا بۆچی خوای كارزان هێندە زەم و سەرزەنشتی فیرعەون دەكا؟ كەچی بە عەكسەوە، لە سووڕەتی (النمل)دا، خوا مەدحی شاژنی سەبەء دەكات و دەفەرموێ:

{قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ إِنِّىٓ أُلْقِىَ إِلَىَّ كِتَٰبٌ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعْلُوا۟ عَلَىَّ وَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَفْتُونِى فِىٓ أَمْرِى مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴿٣٢﴾} النمل.







واتە: شاژن گوتی: ئەی بڕیاربەدەستان! من نامەیەكی بەڕێزم بۆ هاتوە (نێودڕۆكەكەی ئاوایە): ئەم (نامەی)ـە لە سولەیمانەوەیەو، بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، خۆتانم لە بەرانبەردا بە بەرز مەگرن و بە ئاشتییانە وەرنە لام، گوتی: ئەی مەجلیس، پیاو ماقووڵان! ڕای خۆتانم پێ بڵێن، هیچ بڕیارێك نادەم، تاكو ئێوە ڕای خۆتانم پێ نەڵێن.

ئا ئەوە جەوهەری بەكەڵكهاتووی دیموكراسییە، خوا ئاوا مەدحی ئەو شاژنە دەكاو، ئەو هەموو زەمەی فیرعەونیش دەكات، تاكو چاك چاك حاڵیمان بكات، كە دژی خۆسەپاندن و ستەمی سیاسییەو، ڕاوێژ و دادگەریی پێ پەسەند و چاكە، كەچی تەماشا بكەن! هەرچی حوكمڕانی ئەم وڵاتە مسوڵماننشینانەیە، هەموویان وەك فیرعەون دەكەن و، هیچیان وەك شاژنەكە ناكەن، كە خوا مەدحی

www.alibapir.com





کردوە، ئافرەتێك ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ ڕای خەڵك، مەدحکراوە لە شەریعەتدا، بەڵام پیاوێك ئەگەر نەگەڕێتەوە بۆ ڕای خەڵك، زەمکراوە، کەچی تەماشای حوکمی میراتیی و بنەماڵەیی و عەسکەرتاریی و خۆسەپێنی لە دەوڵەتانی کەنداو و دەڵەتانی عەرەبی بە ناوی ئیسلامەوە ، بکەن، ئنجا سەرباری هەموو خەمان، کۆلکە عەلمانییەکانی خۆشمان وادەزان: ئیسلام ئاوایە! بەڵێ کاتێك سەرنجی واقیعی ئۆممەت دەدەین، لەگەڵ ئەوەدا کە خوا فەرمانی پێکردووین، ڕێك پێچەوانەی یەکدییان دەبینین، کە من ئەم پێنج بوارەم بە نموونە هێنانەوە.







لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com

 

**بەرجەستەبوونی دووركەوتنەوە لە وەحیی، لە حەوت دەرهاویشتەی سەرەكییدا:**

ئنجا با تەماشای هەندێك شتی دیكە بكەین، بەرجەستەبوونی لە وەحیی دووركەوتنەوە، دەتوانین لە حەوت دیاردەدا، بە كورتیی باس بكەین:

**یەكەم: نەبوونی بوونناسییەكی ئیسلامیی ڕوون و درەوشاوە:**

زۆر جار كە باسی ئیسلام دەكرێ، سەرەتا باسی ئیمان و عەقیدە دەكرێ، بەڵام لە ڕاستییدا دەبێ بگەڕێینەوە هەنگاوێك پێشتر، بۆ بوونناسیی. ئەوەی كە بە هەڵە دەگوترێ: جیهانبینیی و دنیابینیی، چونكە ئەگەر مانای ئۆنتۆلۆجی (Ontology) بێ {علم الوجود} یان {معرفة الوجود}، وشەی بوون (وجود) هەم بەدیهێنەر (خالق) هەم بەدیهێنراو (مخلوق)یش دەگرێتەوە، بەڵام كە دەڵێی: {دنیابینیی}، هەر ئێرە دەگرێتەوەو، مانای ئەم وشە كوردییە، بچووكترە لەوە كە جێگای مانای {ئۆنتۆلۆجی} تێدا ببێتەوە.





ئیمان و عەقیدەش، بۆ زانیاریتان! لەسەر بناغەی بوونناسیی بنیات دەنرێ: مرۆڤ چۆن خوا دەناسێ؟ چۆن ئەم گەردوونە دەناسێ؟ چۆن ژیان دەبینێ؟ لێرەوە ئیمان و عەقیدە، بناغەی هەڵدەچنرێ، زۆر بەزەییم بە كەسانێكدا دێ، كە بە حیساب ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی دەخوێنن، هیچ لە {بوونناسیی} نازانن و یەكسەر دەچن لە كوێوە دەست پێدەكەن؟ لە (كتاب التوحید)ی (محمد بن عبدالوهاب)ەوە، ئەویش تەوحید بە شێوەیەكی هەڵبزركاو، ئنجا هەیە وادەزانێ

www.alibapir.com



کە ئەو نامیلکەیەی خوێند، تازە تەواو گەیشتۆتە لووتکە! بەڵام وانیە، بۆچی؟ چونکە: سێزدە ساڵان قورئان لە مەککەدا هاتۆتە خوارەوە، دوو لەسەر سێی قورئان، هەمووی باسی ناساندنی خوایە: پەروەردگاریێتیی خوا، بەدیهێنەرایەتیی خوا، خاوەنداریێتیی خوا، ناو و سیفەتەکانی خوا، پاشان ناز و نیعمەتەکانی خوا، ئنجا باسی ژیان و بەسەرهاتی پێغەمبەران و، باسی مرۆڤ و حیکمەتی بوونی و، باسی ڕەوشت و بەها بەرزەکان و...هتد. کە ئەوانە هەموویان موفرەدەکانی بووناسیین، ئنجا کە مرۆڤ بە ڕاستیی خۆی و خوای ناسی و، گەردوونی ناسی و، دنیا و دوارۆژی ناسی، ئەوکات دەنگونجێ ئیمان و عەقیدەیەکی ڕاست و دروستی هەبێ، ئەگەرنا تەنیا بەوەندە کە: مەچۆ لە قەبر مەپاڕێوە! ئیمان و عەقیدە بەوەندە نایەتە دی، کابرا لە خاوەن قەبر ناپاڕێتەوە، بەڵام دوایی دەبێتە کۆیلەی خاوەن قەصر! چەند مەلا و واعیز و ئەهلی فەتواتان پێ شك دێن، بوون بە کۆیلەی خاوەن قەصر! بۆچی؟ چونکە بناغەکەیان تەواو نیە! من لە تەراویحی مزگەوتی حەرام دا دەبینم: نیو سەعات سێ چارەگ دوعا دەکەن، کە هەندێك مەلای خۆشمان لاسایی دەکەنەوەو باسی بەڕڕ و بەحر! باسی شەرق و غەرب! خوایە! هەرچی کافرە بیکوژە، ژنیان بێوەژن بکە، منداڵیان هەتیو بکە، وڵاتیان کاول بکە! کە ئەو دوعایانە هەموویان ناشەرعیین، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەرگیز دوعای وای نەکردوە! ئنجا دەبینین ئەو هەموو دوعایانە دەکرێن، ئەو خەڵکە هەمووی بن هەنگڵی دەتەزێ و لاقی شل دەبن، دواییش کافر هەر ملیان ئەستوور دەبێ و مسوڵمانیش هەر زیاتر ماڵیان وێران دەبێ! کەواتە: دیارە ئەو دوعایانە هیچیان قبووڵ نین، ئنجا لە ڕاستییدا پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) هیچ دوعایەکی

www.alibapir.com




نەكردوە لە خولەكێك تێپەڕێ، بەڵێ دوعای زۆر دووبارە كردۆتەوە، جاری وابووە ئایەتێكی تاكو بەیانی خوێندوە، بەڵام هیچ دوعایەكی نەخوێندوە هەشت نۆ دە لاپەڕە بێ! بەڕێزان! هۆكاری ئەمە ئەوەیە كە تۆ بواری كاری سیاسییت نیە، كە حیزب دروست بكەی، بگرە ڕێی خۆپیشاندانت نیەو، ڕێی مانگرتننت نیەو، ڕێی ڕەخنەگرتنت نیە لە دەسەڵات، دەسەڵاتیش لە جیاتی (أمرهم شورى بينهم) كردوویەتی بە: (أمرهم شوربة بينهم)! هەموو شتێكی بۆخۆی و بنەماڵەكەی قۆرخ كردوە، كابرا هیچ مەجالێكی نیە، بۆیە دێ هەموو تینی خۆی لە دوعایان كردوە!! بەڵام بێگومان دوعا لە جێی خۆیداو، شتی دیكەش لە جێی خۆیدا، ڕۆڵی خۆیان دەگێڕن.





**دووەم: خڵتە كەوتنە گەڵ ئیمان و، ئاوێتە بوونی شیرک لەگەڵ تەنیا خواپەرستیی (توحید)دا:**

ئەگەر تەماشای حاڵی مسوڵمانان بكەین، زۆر بە ئاشكرا دەبینین، كە خڵتەو خاڵێكی زۆر كەوتۆتە گەڵ ئیمانیان و، ژەنگ و ژاری گەلێك جۆرە شیرك، ئاوێتەی خوابەیەكگرتن(توحید)ەكەیان بووە، فەرمایشتی خوا:

{ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ } يوسف.

واتە: زۆربەیان بڕوا بەخوا ناهێنن، مەگەر لە حاڵەتی هاوبەش بۆدانانی دا، بەسەر زۆرێكیان دا دەچەسپێ!

هەڵبەتە پێغەمبەرانی خواش صەڵات و سەلامی خوایان لێبێ، هەموویان بۆ ئەوە هاتوون كە بەس خوا بپەرسترێ، ئنجا خواپەرستیی

www.alibapir.com



یانی چی؟ واتە: تەنیا خوا بەرزترین بێ، خۆشەویستترین بێ، گەورەترین بێ، مل بۆ کەچکراوترین بێ، پشت پێبەستراوترین بێ، لە هەموو ڕوویەکەوە خوا لە سەری سەرەوە بێ! بەڵام تۆ کە تەماشای حاڵ و واقیعی بەشێك، بگرە زۆرێك لە مسوڵمانان دەکەی، ئایا خوایان لە سەری سەرەوە و لە لووتکەدا داناوە؟ یاخود دوای هەمووشتێك، ئنجا حیساب بۆ خوای پەروەردگار دەکەن!؟

**سێیەم: بواری ڕووحیی و ڕەوشت و ئاکار**

ئەگەر لە بواری ڕووحیی و ڕەوشت و ئاکاردا، تەماشای حاڵ و واقیعی مسوڵمانان بکەین، دەبینین: دوورکەوتنەوە لە وەحیی، لەمەشدا زۆر بەرجەستەیە، خەڵکێك هەیە لە ئەهلی تەسەووف و عیرفان و تەزکیە، کە بێگومان ئەوە لایەنێکی گرنگە لە ئیسلامدا، بەڵام کاتێك کە ئیسلام لەوەدا خولاسە دەکرێتەوەو، لایەنی حوکم و سیاسەت و، جەنگ و جیهاد و، عیلم و پەروەردەوە و، فیکر و فەلسەفە و... هتدی لێدادەڕنرێ و دەهێڵدرێتەوە لایەنێکی ڕووحیی و زیکرێکی ڕووت و، دواییش وەك دینێك مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ، ئەوە لە ڕاستییدا لادانە لە ئیسلام و ڕاستە شەقامی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).





ئەوە بەنسبەت بەشێکەوە لە مسوڵمانان و، بەشێکیشیان بە پێچەوانەوە: هەستیارییان بۆ دروست بووە بەرانبەر بەم لایەنە ڕووحیی و مەعنەوییە، لەسۆنگەی ئەوەوە کە زۆرێك لە کتێب و بەرهەمەکانی، هەڵە و پەڵە و لادانیان تێدا هەیە،بەو بیانووەوە، بە تایبەتی ئەوانەی ناو لە خۆیان دەنێن: سەلەفیی، خۆیان بێبەش کردوە لەو کەلەپووری

www.alibapir.com





تەزکیەو تەصەووف و عیرفانە، کە وەك چۆن کتێبەکانی (فیقه) لایەنی یاسا کردەییەکانن و، کتێبەکانی تەوحید و (علم الكلام) لایەنی عەقیدەو تەوحیدن، بەهەمان شێوەش: کتێبەکانی تەزکیەو تەصەووفیش، لایەنی ڕووحیین لە ئیسلامدا، کە تۆ دەبێ لەهەموو ئەو کەلەپووورە بەهرەمەند بیت و هەستیارییت بەرانبەر بە هیچی نەبێ، بەڵام هەمووی بە بێژینگی عەقڵ و لۆژیك و، قورئان و سوننەت، لە بێژینگ بدەی، بە بێژینگی عەقڵ و نەقڵ، نەك هەر لە ڕێوە، بەشێکی یان هەمووی ڕەفز بکەی.

**چوارەم: بواری خێزانیی و کۆمەڵایەتیی**







لە بواری خێزانیی و کۆمەڵایەتییدا، ئەگەر تەماشای حاڵی مسوڵمانان بکەین، دەبینین:

أ- لەلایەکەوە: لاسایی کردنەوەی ڕۆژئاوا بەرنامەیەو، هەندێك وادەزانن: کە ئافرەتان لەوێ چییان کردوە، لێرەش دەبێ وابکەن! بەڵام بێگومان ئەو ئافرەتانەی لە ڕۆژئاوا خۆپێشاندان دەکەن و ناڕازین، گرفت و کێشەیەکی دیکەیان هەیە، خوشکی خۆم! شەرت نیە تۆش ئەو گرفت و کێشەیەت هەبێ! تۆش ڕەنگە گرفت و کێشەت هەبێ، بەڵام هی تۆ جیایە لە هي وان.

ب-لەلایەکی دیکەوەش: لە کاردانەوەی ئەوانەدا کە باسی مافی ئافرەت و ئازادیی ئافرەت دەکەن، تۆش بێنی: ئافرەت لە قوڵلە قاف بکێشی و، سەرقاپی بخەیە سەر و، نەهێڵی هیچ بوون و ڕۆڵێکی هەبێ و،

www.alibapir.com



وەك گوتراوە، بیکەی بەشتێك: (عديم الطعم واللون والرائحة)[1]، هیچ کاراییەکی نەبێ! ئایا ئافرەتان لە کۆمەڵگای پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) وابوون؟ نەخێر، بەڵکو وێڕای بواری دروشمەکانی خواپەرستیی: لە جەنگدا هەبوون، لە کاری سیاسیدا هەبوون، لە کاری بازاڕدا هەبوون، لە هەموو چالاکییەکاندا هەبوون، بەڵام بە ئەدەبی شەرعییەوە.

**پێنجەم: بواری ئیداریی و سیاسیی**

لەبواری ئیداریی و سیاسییدا، ئەگەر سەرنج بدەین، دوورکەوتنەوەی زۆربەی مسوڵمانان لە وەحیی، زۆر شتێکی نمایان و بەرجەستەیە، لە واقیعی ژیانی ئۆممەتدا:

أ- لە ڕووی ئیدارییەوە: زۆربەی مسوڵمانان وڵاتیان بە شێوەیەك ئیدارە دەدرێ، کە لە خزمەتی کەمینەیەکی ملیاردلێر و مشەخۆردایە و، بە زیانی زۆرینەیە.

ب- لە ڕووی سیاسییشەوە: حوکمی میراتیی و بنەماڵەیی و خۆسەپاندن، بۆتە باو لە نێو مسوڵماناندا، وەك: دەستاودەست کردنی دەسەڵات و، پرسکردن بە خەڵك، شتێکی ڕۆژئاوایی بێ، کە لە ئەسڵدا هی ئیسلامی خۆمانە! ئەو کاتە کە ئەبووبەکر خوا لێی ڕازی بێ، لە یەکەمین وتاریدا گوتی: (أَمَّا بَعْدُ أَيُّهَا النَّاسُ! فَإِنِّي قَدْ وُلِّيتُ عَلَيْكُمْ وَلَسْتُ بِخَيْرِكُمْ، فَإِنْ أَحْسَنْتُ فَأَعِينُونِي، وَإِنْ أَسَأْتُ فَقَوِّمُونِي).[2]



---

(١) واتە: بێ تام و بێ ڕەنگ و بێ بۆن.

(٢) السيرة النبوية لابن هشام، دار ابن حزم للطباعة والنشر، والتوزيع، الطبعة الثانية، ٢٠٠٩، ص٦٧١.

www.alibapir.com

 

بەڵێ كاتێك ئەبووبەكر ڕەزای خوای لێبێ، ئەو وتارەی دا، خەڵك لەم ئەورووپایەی ئێستا، كە ئەوكاتە (ڕۆم)یان پێ دەگوت، حوكمڕانی خۆیانیان بە پەرستراو (إله) دەزانی، دەیانگوت: پیرۆز(مقدّس)ە! حوكمی ثیۆكراسیی، كە زۆرێك لە كۆلكە عەلمانییەكان لێیان تێكەڵ دەبێ لەگەڵ حوكمی ئیسلامییدا، لەوێ بووەو هەرگیز لە ئیسلامدا حوكمی ثیۆكراسیی و حوكمی دینیی نەبووە، واتە: كەس نەیگوتوە: من كراوم بە حوكمڕان بەسەرتانەوەو خوا وای فەرمووە! ئەبووبەكر ڕەزای خوای لێبێ، دەڵێ: كراوم بەسەرپەرشتیار بەسەرتانەوە، {واتە: خۆتان داتان ناوم} لە ئێوەش چاكتر نیم، ئەگەر چاكم كرد هاوكارم بن و، ئەگەر خراپیشم كرد، ڕاستم بكەنەوە.





نەشیگوتوە: من بێ هەڵە و پەڵەم، بڕواتان بێ ئێستا لە دەستووری هێندێك لە وڵاتانی ئیسلامییدا هەیە دەڵێ: (الملك ذاتٌ مقدّسة لا تُمسُّ) پادشا پیرۆزەو نابێ ڕەخنەی لێ بگیرێ! ئەوەشی كە نەینووسیوە لە دەستوورەكەیدا، بە كردەوە وایەو، هەر ڕەخنە بگری، خوێنت حەڵاڵە! ئنجا ئایا ئەمە چ پەیوەندییەكی بە ئیسلامەوە هەیە؟! لە كاتێكدا كە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: (أَفْضَلُ الْجِهَادِ: كَلِمَةُ عَدْلٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ)[1] واتە: گەورەترین جیهاد: قسەیەكی دادگەرانەیە، یان قسەیەكی حەقە، لای حوكمڕانێكی ستەمكار.

هەروەها دەفەرموێ: (سَيِّدُ الشُّهَدَاءِ: حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَرَجُلٌ قَامَ إِلَى إِمَامٍ جَائِرٍ فَأَمَرَهُ وَنَهَاهُ، فَقَتَلَهُ)[2] واتە: گەورەی شەهیدان حەمزەی

---

(١) رواه أبو داود: ٤٣٤٦، وصححه الألباني.

(٢) رواه الحاكم: ٤٨٨٤، وقال صحيح الإسناد.

www.alibapir.com





کوڕی (عبدالمطلب)ەو، پیاوێکە ڕادەپەڕێ لە دەسەڵاتدارێکی ستەمکار ئەمر و نەهی لەگەڵ دەکا، ئەویش دەیکوژێ.

ئەو کەسە دەچێتە ئاستی حەمزە، خوا لێی ڕازی بێت، کەچی تۆ بێنی بە ناوی شوێنکەوتنی سەلەفی سالحەوە: خۆپێشاندان لە خەڵك قەدەغە بکەی، مانگرتن قەدەغە بکەی، ڕەخنەگرتن قەدەغە بکەی! ئەمە چ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە هەیە؟! بێگومان ئەوە تەنیا حوکمێکی میراتیی و بنەماڵەیی پووچە، لەو کاتەوە کە ئومەوییەکان دایانمەزراند، کە پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) دەفەرموێ: (أَوَّلُ مَنْ يُغَيِّرُ سُنَّتِي رَجُلٌ مِنْ بَنِي أُمَيَّةَ)[1] واتە: یەکەمین کەس کە ڕێبازی من تێکدەدا و دەیگۆڕێ، پیاوێکە لە بەنی ئومەییە، کە بێگومان مەبەستی پێ (معاویە بن أبی سفیان)ە، کە بەزۆر (یزید) ی کوڕی سەپاند و بەیعەتی بۆ وەرگرت! ئنجا ئایا موعاویە ڕێبازی پێغەمبەری چۆن گۆڕی؟ گوتی: بەر سمێڵان مەکەن؟ گوتی ڕیشن مەهێڵنەوە؟ گوتی سیواك مەکەن؟ ئاخر زۆر لە مامۆستاکانی خۆمان وشەی سوننەت هەر بەو شتانە لێی حاڵین! بەڵام نەخێر (سنّة) یانی: بەرنامە و ڕێباز (المنهج والطریقة)، پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم) کە دەفەرموێ: (عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ مِنْ بَعدي، عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ)[2] واتە: ڕێبازی من و ڕێبازی خەلیفە سەرڕاستە هیدایەت دراوەکان بگرن، ددانانی لەسەر ڕۆ بگرن.

لێرەدا (سوننەت) یانی ڕێباز و شێوەی حوکمڕانیی و ئیدارەدانی وڵات، ئەگەر نا ئەبووبەکر و عومەر و عوثمان و عەلی، خوا لێیان

---

(١) أخرجه ابن أبي شيبة: ٣٧٠٢٧، وصححهالألباني في الصحيحة.

(٢) أخرجه الترمذي: ٢٦٧٦، و ابن ماجه: ٤٢، و أحمد:١٧١٤٢، وصحّحه الألباني في (السلسلة الصحيحة): ٢٧٥٣ .

www.alibapir.com



ڕازی بێ، دوو ڕكات نوێژی سوننەتیان زیاد نەكردوە و، ڕۆژووی سوننەتیان زیاد نەكردوە، سوننەتێكیان زیاد نەكردوە لەو سوننەتە جوزئییانە، نا! واتە: ڕێبازی من و ڕێبازی خەلیفە ڕاشیدەكان بگرن لە شێوەی حوكمڕانییدا، یانی: مەیكەنە میراتیی و بنەماڵەیی و پادشایەتی، لە بابەوە بۆ كوڕ و، لە كوڕەوە بۆ نەوە بڕوا! كە ئەوە ئومەوییەكان دایانمەزراندو، عەبباسییەكان بە دوایاندا هاتن و، دوای عوثمانییەكان و، ئێستاش لەگەڵدا بێت هەروایەو، ڕەنگێكی خراپ ڕێژرا، كە ئوممەت بە دەستییەوە گرفتارە!

## شەشەم: بواری شارستانیی و ئاوەدانكردنەوەی دنیا و، شارسازیی و بەرەوپێشبردن



ئایا لە بواری شارستانیی و ئاوەدانكردنەوەی دنیا و، شارسازیی و بەرەوپێشبردندا، ئێمە لە كوێین!؟ ئێستا مسوڵمانان تەنیا بەكاربەر (مستهلك)ن، تەنیا ئەو شتانەی كە لە كافرستان دروست دەكرێن، ئێمە بەكاریان دێنین: هەر لە جل و بەرگەوە، هەتا كەل و پەل و تڕومبێل و هەموو شتێك، ئەبوحامیدی غەززالیی نۆسەد(٩٠٠) ساڵ لەمەوپێش لە كتێبی (إحیاء علوم الدین)دا [١] دەڵێ: لەسەر مسوڵمانان فەرزە هەر شتێك كە پێویستییانە بۆخۆیان دروستی بكەن، دوایی دەڵێ: ڕەنگە پێتان سەیر بێ ئەگەر بڵێم: چنینی بەرگ و دارتاشیی و چی و چی، هەموو ئەو پیشانەی كە ژیانی مسوڵمانان پێویستی پێیانەو، دەبێ بۆخۆیان بیانزانن، نەك پێویستییان بە غەیری خۆیان بێ! ئایا مسوڵمانان چەند گوناهبارن! كە لە بواری شارستانییەت و ژیار و وڵات بەڕێوەبردن دا، بۆ هەموو شتێك ئاتاجی غەیری خۆیانن؟!

---

(١) ج١، ص٣٤، ط٣ دار صادر، ٢٠١٠م، (باب العلم الذي هو فرض كفاية على المسلمين).

www.alibapir.com




**حەوتەم: نا ئاشنابوونەوەی مسوڵمانان، بە یاسا گەردوونییەکان**

خاڵێکی دیکە کە دوورکەوتنەوەی مسوڵمانان لە وەحیی تێدا بەرجەستەیە، دەیکەمە کۆتایی ئەم بەشە: نا ئاشنابوونەوەی مسوڵمانانە بە یاسا گەردوونییەکان. -وەك دوایی لە وتاری دووەمدا باسی دەکەم- خوا(عزوجل) لە چەندان شوێندا، باسی یاساکانی خۆی دەکا، لە ژیانی بەشەردا و، لە گەردووندا و دەفەرموێ: لێیان حاڵی بن و تێیان بگەن! ئێستا وڵاتانی نامسوڵمانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بەچی بەرەو پێشچوون؟ بێگومان یاساکانی خوایان دۆزیونەوە و لێیان بەهرەمەند بوون، وەك چۆن ئامێرێك کە دروست دەکرێ، بە هۆی کەتەلۆکەکەیەوە، دەزانی چۆن بەکار دێ! تۆش دەبێ یاساکانی خوا لە گەردووندا بدۆزیەوەو، لەسەر بناغەی ئەو زانست و شارەزاییە، مامەڵە لەگەڵ گەردووندا و، لەگەڵ نیعمەتەکانی خوادا بکەی، ئنجا لێیان بەهرەمەند دەبی، ئەگەر نا، بە نەزانیی مامەڵە لەگەڵ نیعمەتەکانی خوادا بکەی، وەك ئەوە وایە، بە پێی کەتەلۆك مامەڵە لەگەڵ ئامێرێکدا نەکەی، دەیشکێنی و سەقەتی دەکەی! یاساکانی خواش دەبێ بیاندۆزینەوە، کە مسوڵمانان لە بواری دۆزینەوەی یاسا گەردوونییەکاندا، چ لە ژیانی خۆیاندا و، چ لە دەوروبەرو بوونەوەردا، زۆر لە دواوەن، کە ئەمەش هەمووی پێچەوانەی ئەوەیە کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردوون.





کەواتە: ئێستا ئێمە کە هەتا ڕاددەیەك بۆمان دەرکەوت: واقیعی دژواری ئۆممەتی ئیسلامیی چۆنەو هۆکارەکانیشی چین؟ خوا پشتیوان بێ لە وتاری داهاتوومدا باسی چارەسەر دەکەین.

www.alibapir.com



## بـــەڕێـــــزان!

دێینە سەر تەوەری سێیەمی بابەتەكەمان: ئایا چارەسەری ئەو واقیعە دژوارو ناهەموارەی كە ئۆممەتی پێغەمبەر(محمد) (صلی الله علیه وسلم)ی تێدایە، بە چی دەكرێ و، چۆن دەكرێ و، دەبێ چی بكەین؟ جارێكی دیكەش بۆتان تەئكید دەكەمەوە: كە ئەوەی من دەیڵێم، گوشراو و پوختەو شیلەی ئەوەیە كە دەبێت بگوترێت، ئەگەر نا ئەو بابەتە، زۆری دەوێ قسەی لەسەر بكرێت.

بۆ چارەسەری ئەم واقیعەی كە ئۆممەتی پێغەمبەری تێدایە، مسوڵمانانی تێدان، -بە بۆچوونی من- پێویستە حەوت هەنگاو بنرێن:





www.alibapir.com




## هەنگاوی یەکەم

## خوێندنەوەی ڕاست و دروستی واقیع

واتە: واقیعی ئۆممەتی ئیسلامیی و، ئەو جیهانەی کە تێیدا دەژین، دەبێ کەموکوڕییەکانمان وەك خۆیان ببینین و، پەنجەشیان بخەینە سەر، بەبێ خاتری خۆ گرتن و، بەبێ زوڵم لە خۆ کردن، چونکە زۆر جار لە کاتی باسکردنی گرفت و کێشە و کەم وکوڕییەکدا، ئینسان ئەگەر لە خۆی وریا نەبێت: یان زوڵم لە خۆی دەکا، یا زوڵم بۆ خۆی دەکا: زوڵم لە خۆی دەکات، بەوە کە: شتێك خەتاشی نەبێت، بڵێت: خەتامە، ئەوە زوڵم لە خۆ کردنەو، بە عەرەبیی پێی دەگوترێ: (جلد الذات) لە خۆدان، بەبێ ئەوەی پاساوێکی هەبێ، زوڵم بۆ خۆ کردنیش ئەوەیە کە تۆ خەتاشت بێ، هەر بۆخۆتی پاساو بدیەوە و، دەستی خۆت بە خەڵك بسڕی، هەق ئەوەیە کە ئینسان ئەو خەتە نێوەڕاستە بگرێ، نە زوڵم لە خۆی بکات و نە زوڵم بۆ خۆی بکات.





بێگومان ئێمە کە باسی ئۆممەت دەکەین، دەزانین کە بارودۆخی ئۆممەت هەمووی بە ئێمە چاك نابێت، بەڵام هەر کەسە دەبێ لە خۆیەوە دەست پێبکات، ئێمە لە وڵاتی عێراق داو، لەم هەرێمی کوردستانەداو، هەر کەسێکی دیکە لە هەر شوێنێکدا، بە تەئکید ئەگەر مسوڵمانان هەر کامێکیان خەمی خۆی بخوات و هەوڵبدات، بەسەر گرفت و کێشەکانی کۆمەڵگای خۆیدا زاڵ بێت و، ڕێی چارەسەر بگرێتە بەر، حاڵی ئۆممەت دەگۆڕدرێ، ئۆممەتی ئیسلامیی لە کێ پێك دێت؟ نەتەوەی: کوردە، فارسە، عەرەبە، تورکە، ئەفغانە، کێیە، کێیە، ئنجا عێراقەو، لە نێو عێراقدا هەرێمی کوردستانە و، ئوردون و

www.alibapir.com



سوریاو لوبنانە و فەلەسطینەو میصرە و پاکستانەو...هتد، ئۆممەت لە هەموومان پێك دێت.

لەو بارەوە با تەماشای ئەم ئایەتە موبارەکە بکەین، لە سوورەتی (یوسف)دا خوا بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

{قُلْ هَٰذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ} یوسف، ١٠٨.

واتە: بڵێ: ئەمە ڕێبازی خۆم و ئەوانەیە کە شوێنم کەوتوون، لەبەر ڕۆشناییدا (خەڵك) بۆ لای خوا بانگ دەکەم و، پاکیی بۆ خواو من لە هاوبەشدانەران نیم.





بانگەواز دەکەم لەبەر ڕووناکییدا، یانی: بەرچاوڕوونم لە ئایینەکەمدا، بەرچاوڕوونم لە کۆمەڵگاکەمدا، بەرچاوڕوونم لە واقیعەکەمدا، کە تێیدا دێم و دەچم و، تێیدا دەجووڵێم و، بەرچاو ڕوونم لەوانەدا کە بانگیان دەکەم، لە پاشخانی فکرییان، لە پاشخانی سیاسییان و، کۆمەڵایەتییان، گرفت و کێشەکانیان، زۆر گرنگە کە ئێمە واقیعەکەمان وەك خۆی ببینین و، بوێرانەش بڵێیین: بەڕاستیی فلان نوقسانییەمان هەیە، ئەمە یەکەمین هەنگاوی چارەسەرە، یەکەمین هەنگاوی چاککردنی واقیعی ئۆممەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە هەر گۆشەو کەنارێکیدا، بریتیە لەوەی واقیعەکە وەك خۆی ببینی، چ واقیعی ئۆممەت، چ واقیعی دنیاو، گرفت و کێشەکانی و، دەردو نەخۆشییەکانی پەنجەیان بخەیە سەر، وەك ئەم ئایەتە موبارەکە ئاماژەی پێ دەکات، چونکە ئەگەر بەرچاوڕوون نەبین، هەم لە دینەکەماندا و، هەم لە واقیعەکەماندا، ناتوانین ڕێك و ڕاست، هەنگاو بنێین و، هەڵسوکەوت بکەین، فەرمایشتێکی پێغەمبەر

www.alibapir.com



هەیە (صلى الله علیه وسلم) لە موسنەدی (أحمد)[1]دا هاتوە، ئەویش تیشكێكی باش دەخاتە سەر ئەم بابەتە، دەفەرموێ: (إذا أَحَبَّ الله عبداً، زهَّدَه في الدنيا وأبْصَرهُ بعيوب نفسه). واتە: ئەگەر خوا بەندەیەكی خۆشویست، دنیای لەلا كەم دەكات {وای لێ دەكات دنیا بەكەمگر بێ} و عەیبەكانی خۆیشی دەكاتە بەرچاوی.

هەروەها لە شوێنەوار(أثر)ێكدا هاتوە: {طُوبَى لِمَنْ شَغَلَهُ عَيْبُهُ عَنْ عُيُوبِ النَّاسِ} خۆشیی بە حاڵی ئەو كەسەی، كە عەیب و كەموكوڕیی خۆی، بێ ئاگای دەكا لە عەیب و كەموكورییەكانی خەڵك، مەبەست ئەوە نیە كە كەموكوڕیی خەڵك نەبینی، مەبەست ئەوەیە: عەیبی خۆمان ببینین، كەموكوڕییەكانی خۆمان ببینین، چونكە وەك كەموكوڕیی خۆت زیانت لێدەدا، كەموكوڕیی كەس هێندە زیانت لێنادات، جاری دیكەش باسم كردوە: عەیب و نوقسانیی ئینسان، پێش بەرانبەرەكانی، بۆ خودی خۆی زەرەرەو، هەر كەموكوڕییەك، پێشتر خاوەنەكەی لێی زەرەرمەندە، ئنجا دوایی ئەوانەی كە مامەڵەیان لەگەڵدا دەكات، لێی زیانمەند دەبن.

لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
كەناڵی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
English - عربي - كوردی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر

---

(١) {إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِعَبْدٍ خَيْراً فَقَّهَهُ فِي الدِّينِ، وزهده في الدنيا، وبصَّره عيوبَه} أخرجه البيهقي في شعب الإيمان: ١٠٥٣٥، مرسلا.

www.alibapir.com





## هەنگاوی دووەم

## قەناعت هەبوون بە گۆڕانكاریی و، هەبوونی ئیرادەی گۆڕانكاریی و پاكسازیی و چاكسازیی

زۆر كەس واقیعەكە وەك خۆی دەبینێ، دەڵێ: بەڵێ ئەو نەخۆشییەمان هەیەو، ئەم كەموكوڕییەمان هەیە، بەڵام قەناعەتی بەوە نیە گۆڕانكاریی بكرێ. كاك ئەحمەدی موفتی زادە، لە یەكێ لە كاسێتەكانیدا گوێم لێبووە، دەگێڕێتەوە دەڵێ: كاتی خۆی لە (سنە) كابرایەكی كاروانچیی هەبووە، زۆر بە شان و شەوكەت و بەهێز بووە، هێزی سێ چوار كەسی هەبووە، بەڵام غیرەتی نەبووە و ئازا نەبووە. جارێك بە شوێنێكدا دەڕۆن، باتڵاغێك دەبێت، یەكیان وڵاغەكەی لێ دەكەوێ و، بەبارەوە دەكەوێتە باتڵاغەكەوە، ئنجا دوو سێییەكیان دێن وڵاخ و بارەكە، لە قوڕ و باتڵاغەكە بێننە دەرێ، بۆیان نایەتە دەرێ، كابرای بەهێز دەڵێ: لابچن ڕێی من بكەن! هەر ئاوا دەیگرێ، لای سەری و لای كلكی دەگرێ و، بە بارەوە لە قوڕەكە دەریدێنێ و، لە بەیار دایدەنێ! سێ چوار كەس كە ڕێگر بوون خۆیان مەڵاس داوەو، بەتەما بوون ئەو كاروانە ڕووت بكەن، لەبەینی خۆیاندا دەڵێن: خۆتانیان لێ ئاشكرا مەكەن، ئەو كابرایە هەر لێمان دەست بەكار بێ، یەكمان ناهێڵێ! بەڵام كابرا نازانێ ئەوانە خۆیان مەڵاس داوە، لەبەر خۆیەوە دەڵێ: ئای زۆرەكە بۆ غیرەتێ! كاك ئەحمەد بە لەهجەی سنەیی دەیڵێ، زۆر یانی قووەت، واتە: بریا ئەو قووەتە غیرەتیشی لەگەڵ دابایە! ئەوانەی كە خۆیان





www.alibapir.com





مەلاس داوە، دەڵێن: دیارە ئەو پیاوە غیرەتی نیە، با لێیان وەخۆ بکەوین و، فیعلەن ڕووتیان دەکەنەوە.

بەڕاستیی بەڕێزان! جاری وا هەیە ئینسان شت دەزانێ و دەیبینێ، بەڵام ئیرادەی نیە کە بە گژیدا بچێتەوە، لە خۆی ڕانابینێ، ئنجا ئەو لەخۆ ڕاپەڕموون و خاوەن ئیرادە بوونە، زۆر گرنگە، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ:

{إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ} الرعد، ١١.

واتە: خوا حاڵەتێك كە كۆمەڵێك تووشی بوون، لای نادات و نایگۆڕێ، تاكو ئەوان خۆیان نەگۆڕن.



بەڵێ، گۆڕینی خوا، شوێن گۆڕینی مرۆڤ دەکەوێت، دەبێ مرۆڤ خۆی بگۆڕێ، ئنجا خوا واقیعی بۆ دەگۆڕێ، دەبێ مرۆڤ دەروونی خۆی بگۆڕێ، دەروونی مرۆڤ چییە؟ بیرکردنەوەکانی، هەست و نەستەکانی و، ڕەفتارەکانی، (الأفكار والمشاعر والسلوكيات) دەبێ ئەوانە بگۆڕێ، کە لەبەر دەستی خۆیدان. هەندێك كەس بە شتێکەوە دەق دەگرێ، تاکو قیيامەتێ، هەتا پێیەوە دەمرێ، دەڵێن: (مار) هەموو ساڵێ کیفێك، کاژێك فڕێ دەدا، تۆش جارجار خۆت بگۆڕە، ڕەنگە هەندێك بیرۆکەت هەبن، کاتیان بەسەرچووبێ، جارجار هەندێ لە عەلمانییەکان ڕەخنە لە من دەگرن: وەختی خۆی فلان کەس وای گوتوە ئێستا وا دەڵێ! هەرچەندە پێم وانیە لە شتێکی بنەڕەتییدا بووبێ، بەڵام ئەگەر واشبێت، ئەوە عەیبی چییە؟ ئەوە ئازایەتییە، کە ئینسان بتوانێ بیروبۆچوونێکی هەبووە، بە کەڵکی کاتی خۆی هاتوە، بەڵام ئێستا بە کەڵك نایەت، یان وایزانیوە بە کەڵك





www.alibapir.com




دێت کاتی خۆیشی، دوایی بۆی دەرکەوتوە بە کەڵك نایەت، ئەگەر بیگۆڕێ، ئەوە ئازایەتییە هەر کەسێك بیکات، (أبو حامد الغزالي) ڕەحمەتی خوای لێبێ، چ ئینقلابێکی بەسەر خۆی داهێنا! (أبو حسن الأشعري) چ گۆڕانێکی بەسەر خۆی داهێنا؟! موعتەزیلە بوو، دوایی بوو بەو کەڵە پیاوە کە ناوی لێندرا: (پارێزەری عەقیدەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت) بە هەر حاڵ، ئینسان عەزم و ئیرادەی هەبێ، دوای ئەوەی کە دەزانێ: واقیعەکەی هەڵەو خوارە، ئنجا دەبێ ورەی هەبێ کە بەگژی دابچێتەوە و قەناعەتی هەبێ کە دەگونجێ بیگۆڕێ، هیچ شتێك نیە ئینسان نەتوانێ بیکا! لەو کتێبانەدا کە باسی گەشەپێدانی مرۆیی (التنمیة البشریة) دەکەن، کە زۆرجار زێدەڕۆیی (مبالغة)شیان تێدایەو، دەبێ بە تێبینیی و سەرنجەوە ئەو شتانە بخوێننەوە، بەڵام بۆ نموونە: قسەیەکیان تێدایە دەڵێ: ئەگەر کابرایەکی ئیفلیج لە پێشبڕکەدا یەکەم نەبێت، خەتای خۆیەتی! کە بێگومان ئەوە زێدەڕۆییە، مەبەست ئەوەیە ئینسان لە خۆی ڕاببینێ و ئیرادەی هەبێ، کە دەتوانێ شت بکات، هەتا قەناعەتت نەبێ کە تۆ دەتوانی کار بکەی، کارت بۆ ناکرێ.



با نمونەیەکتان لەژیانی خۆم دا بۆ بهێنمەوە: مامۆستایەك هەبوو، ناوی مامۆستایەکە ناهێنم، بە ڕەحمەتی خوا چووە، لە ساڵانی هەشتایەکاندا، پیاوێکی خواناس و دیندار و ئەهلی عیلم بوو زۆر شارەزا بوو، ڕۆژێك گوتم: مامۆستای بەڕێز! ئەرێ جەنابت پیاوێکی زۆر شارەزای، مامۆستایەکان دێن پرسیار لەتۆ دەکەن، بۆچی کتێبێ نانووسی، ئەو عیلمەی جەنابت کە وەفاتت کرد، هەمووی دەفەوتێ، بۆچی کتێب نانووسی و بەرهەمێکت نیە؟ ئەویش گوتی: فلان! من کتێب بنووسم؟ گوتم: بەڵێ، گوتی:

www.alibapir.com




من هیچ نیم! منیش ئاوا تەماشم کرد و گوتم: جەنابی مامۆستا! چۆن؟ جەنابت زۆر زانای! گوتی نا نا! من هیچ نازانم!

هەڵبەتە تەوازوع و خۆ بە کەمگرتن باشە، بەڵام ئەگەر زێدەڕۆییت تێدا کرد، زوڵم لە خۆت دەکەی، هەروەك نەفس بەرزیی (عزّة النفس) باشە، بەڵام کە زێدەڕۆییت تێدا کرد، دەبێتە خۆ بەزلگریی (تكبّر)، هەروەها خاکیبوون (تواضع) ئەگەر زێدەڕۆییت تێدا کرد، دەبێتە خۆ پێ هیچ بوون، ئنجا کەسێ خۆی پێ هیچ بێ، هەر هیچ دەبێ و، هیچیشی لێ هەڵناوەرێ!





لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
عربي - كوردی - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com





## هەنگاوی سێیەم

## گەڕانەوە بۆ وەحیی و پەیامی خوا

هەموو دەردو نەهامەتییەکان، بەهۆی دوور کەوتنەوە لە وەحیی و پەیامی خواوەن، بۆتان هەیە بپرسن: ئەدی بۆچی نەتکردە هەنگاوی یەکەم؟

بۆیە نەمکردە هەنگاوی یەکەم، چونکە وەحیی و پەیامی خوا، بۆخۆی کار ناکات، وەك دەرمان و چارەسەرێك وایە، دەبێ کەسێك بیگرێتەوە و بەکاری بێنێت. بۆیە دەبێت پێش ئەوە، واقیعەکە وەك خۆی ببینین، پاشان ئیرادەمان هەبێ کە ئەو واقیعە چاك بکەین، ئنجا ئیستیفادە دەکەین لە وەحیی و پەیامی خوا، ئەگەر نا ئەگەر بێت و واقیعەکە وەك خۆی نەبینی، مسوڵمانان بە شتێکەوە سەرقاڵ دەکەی، کە هیچ مەدارێکیان ساز ناکات، ئەوان شوێنێکیان دێشێ و، تۆ چارەی شوێنێکی دیکە دەکەی! وەك هێندێك هەن، مسوڵمانان سەرگەرم دەکەن و، هەراو کێشەی لابەلایان بۆ بەرپا دەکەن: لە تەحییاتدا پەنجەی جوڵاندوە، یان نەیجووڵاندوە؟ دەستی لە سەرسینگ گرتوە، یان لەخوارتر؟! دەلینگی پانتۆڵی وایە، یان وانیە؟ مەولید بیدعەتە، یاخود ڕەوایە! کوردەواریی خۆمان دەڵێن: خاوەن باراش لە خەیاڵێك داو، ئاشەوان لە خەیاڵێك دا! مسوڵمانان چ گرفتێکیان هەیەو تۆ خەریکی چی! هەرچەندە پێم وایە مسوڵمان بۆ دینداریی شەخسیی خۆی، هەتا لێبکۆڵێتەوە لە وردەکارییەکان چاکترەو بۆخۆشم وا دەکەم، لە خوا بەزیاد بێ، لەبواری خۆ پاراستن





www.alibapir.com



لە بیدعەتان و، پابەند بوون بە ڕێبازو ڕێ و شوێنی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم)، بەڵام ئایا مەرجە ئەوەی تۆ دەیکەی، بە هەموو خەڵکی بکرێ؟ ئایا مەرجە ئەو جۆرە دیندارییە شەخسییە، کە لەلای تۆ پەسەندە، یان پێویستە، مسوڵمانانیش ئەوە گرفت و کێشەیان بێت؟ دەگونجێ ئەوان کێشەی دیکەیان هەبێ! ئنجا ئایا مسوڵمانەتیی تەنیا لەوەدا خولاسە دەبێتەوە؟

بەڵێ گرنگە ئێمە بگەڕێینەوە بۆ وەحیی و پەیامی خوا، لە هەموو ڕوویەکەوەو لە هەردووك بواری دینداریی و دنیادارییدا، خوا (سبحانە وتعالی) چی دەربارەی پەیامی خۆی دەفەرموێ:



{ إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَهۡدِي لِلَّتِي هِيَ أَقۡوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرٗا كَبِيرٗا } الاسراء، ٩.





واتە: بە دڵنیایی ئەم قورئانە (خەڵك) ڕێنمایی دەکا بۆ ژیانێك، {بۆ شێوە مامەڵەیەك} کە ڕاستترینەو چاکترینە لە هەموو ڕوویەکەوە.

چونکە خوا بە ڕەهایی فەرموویەتی. (لِلَّتِي) ئەمە (الإسم الموصول)ە، کە (صلة)کەی قرتێنراو (محذوف)ە، وەك: (للحياة التي هي أقوم) یان (للحالة التي هي أقوم) یان (للهيئة التي هي أقوم)، خوای پەروەردگار وای هێناوە کە تۆ هەر شتێکت بوێ، قورئان ڕێنماییت دەکات، بۆ باشترین جۆرە مامەڵە لەگەڵ ئەو شتەدا، لە هەردوو بواری دینداریی و دنیادارییدا.

لە سوورەتی (التكوير)دا، خوای کارزان دەفەرموێ:

{إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ﴿٢٨﴾} التكوير.

www.alibapir.com





واتە: ئەم قورئانە تەنیا بیرخەرەوەیە، بۆ جیهانییان، بۆ هەر كەسێ لەئێوە، كەبیەوێ ڕاست بێ.

لە هەر ڕوویەكەوە بتەوێ ڕاست بی، ئەوە قورئان لەبەر دەستتە. بەڵام گرنگە ئێمە ئەو باوەڕ و متمانەیەمان بێت كە فەرموودە و فەرمایشتی خوا، ئێمە ڕێنمایی دەكا بۆ چاكترین حاڵەت، ئێمە وا لێ دەكات ڕێك و ڕاست و چاك و پاك و ساغ بین.

یەكێك بۆی هەیە بپرسێ: ئەدی كوا باسی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم)؟ دەڵێین: پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) كە هاتوە تەنیا قورئانی پێ بووەو فەرموویەتی: {لا تكتبوا عني ومن كتب عَنِّي غير القرآن فَلْيَمْحُهُ}[1] واتە: فەرموودەكانی من مەنووسن و هەركەسێك لەمنەوە شتێكی نووسیوە جگە لە قورئان، بابیسڕێتەوە. (أبوبكر) خوا لێی ڕازی بێ، لێی گێڕراوەتەوە[2]، كە ویستی فەرمایشتەكانی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) كۆبكاتەوەو هەندێكیشی كۆكردبوونەوە، دایكمان عائیشە دەڵێ: پێش ئەوەی وەفات بكات، گوتی: ڕۆڵە! ئەوانەم بۆ بێنە ئەو حەدیسانەی كۆمكردبوونەوە، چونكە شتێك ناكەم پێغەمبەری خوا نەیكردبێ، یان شتێك ناكەم خەڵك بە غەیری قورئانەوە مەشغووڵ بێ و، سووتاندنی، (عمر)یش خوا لێی ڕازی بێت، لەهەندێك سەرچاوان دا[3] هاتوە، ئەویش دوای مانگێك (إستخارة)كردن و ڕاوێژكردن،

---

(١) رواه مسلم: ٣٠٠٤، وأحمد: ١١٣٦٢ وغیرهما.

(٢) تذكرة الحُفّاظ (٥/١).

(٣) طبقات ابن سعد (١/٣) ص ٢٠٦، وكنز العمّال (٢٣٩/٥).

www.alibapir.com



ویستی وەك چۆن قورئان کۆکرایەوە لە موصحەفدا، {هەر هەبوو بەڵام خرایە نێوان دوو بەرگەوە}، سوننەتی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) کۆبکاتەوە، بەڵام دوایی گوتی: وام پێ باشە خەڵك بە غەیری قورئانەوە سەرقاڵ نەکەم، دیارە عوسمانیش نەیکردووە، عەلیش نەیکردوە، خوا لێیان ڕازی بێ، لە ساڵی سەد(١٠٠)ی کۆچیی، یانی سەد(١٠٠) ساڵ دوای کۆچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە مەککەوە بۆ مەدینە، لە سەردەمی (عمر بن عبدالعزیز)دا فەرمان دەکات فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆبکەنەوە، ئنجا ئایا بۆچی ئەوان کۆیان نەکردووە، ئەو کۆیدەکاتەوە؟ ئەوان بۆیە کۆیان نەکردۆتەوە، گوتوویانە: با خەڵك بە غەیری قورئانەوە سەرقاڵ نەبێ، بەڵام ئەدی (عمر بن عبدالعزیز) کە خەلیفەیەی ڕاشیدە بۆچی کۆیکردەوە؟ چونکە زانی تازە قورئان چەسپاوە، تێکەڵ نابێ لەگەڵ شتی دیکەدا.





بەڕێزان! ئەگەر ئینسان تەماشای ئەزموون و دینداریی میللەتانی پێشوو بکات، ئنجا لە حیکمەتی هەڵوێستی پێغەمبەر علیه الصلاة وسلام تێدەگات کە فەرموویەتی: {لا تکتبوا عنِّي}، هەروەها لە حیکمەتی هەڵوێستی (أبوبکر) و (عمر)یش، خوا لێیان ڕازی بێت، دوایی (عثمان) و (علي)یش، کە هەر وایان کردوە، ئەوجار لە حیکمەتی ئەوە حاڵی دەبێت.

بۆنموونە: (پەیمانی کۆن) کە خاڵی هاوبەشی بەینی جوولەکە و نەسرانییەکانە، بە شەرحەوە دوو هەزار(٢٠٠٠) لاپەڕە دەبێ، (پەیمانی نوێ)ش کە تایبەتە بە نەسرانییەکانەوە، هەزار (١٠٠٠) لاپەڕە زیاترە، خوا تەوراتی بۆ مووسا ناردوە، تەوراتی بە دانپێداهێنانی جوولەکەکان

www.alibapir.com





خۆیان پێنج سیفره، سیفرەکانی: {التکوین، الخروج، اللاویین، العدد، التثنیة}، بەڵام ئێستا (پەیمانی کۆن) کە تەوڕاتی لە نێودایە، سی و نۆ (٣٩) کتێبە بە سەرژمێرێك و، چل و نۆ (٤٩) کتێبە بە سەرژمێرێکی دیکە! (پەیمانی نوێ)یش، خوا یەك ئینجیلی بۆ عیسا ناردوە، کەچی ئێستا بە ڕەسمیی نەسرانییەکان، چوار ئینجیلیان هەن: ئینجیلی مەتتا، لووقا، مەرقوس و یوحەننا، هەروەها (نامەکانی پۆلس- رسائل بولس)یش هەن، کە بە هەموویان (پەیمانی نوێ) پێکدێنن، خواش یەك ئینجیلی ناردوە!! لێرەدایە کە خەلیفە ڕاشیدەکان ترساون لەوەی کە حەدیس کۆبکەنەوە و، لەسەر پەراوێزی قورئان بینووسن، دوایی تێکەڵ بێ، ئیحتیاتیان کردوە، تاکو تێکەڵ نەبێ.



ئێستا قورئان دەزانن چەند سوورەتە؟ (١١٤) سوورەتە، دەزانن قورئان چەند ئایەتە؟ بەڵێ، قورئان (٦٢٣٦)، ئەوە بەپێی باوترین سەرژمێر،[1] هەندێکی دەڵێن (٦٦٦٦)، ئەوە هەر قسەیەکە بۆخۆشیی کراوە، ئەدی قورئان چەند وشەیە؟ ئەویش دیارە: (٧٧٤٣٩) وشەیە، ئەدی قورئان چەند پیتە؟ ئەویش هەر دیاریی کراوە: (٣٢١١٨٠) پیتە.

تەماشا بکەن! ئەوە لە کوێ کە قورئان پیتەکانیشی دیارن و مسوڵمانانان هەموویان لەسەری یەکدەنگن، کەچی کۆلکە خوێندەواری وا ڕاست دەبێتەوە، بەتایبەتی هەندێك لەوانەی سەر ئەو کەناڵانەی

---

(١) لە هەندێك سەرژمێریشدا: (٦٢١٢، ٦٢١٦، ٦٢١٨، ٦٢٢٤)، هەڵبەتە جیاوازیی ئەو ژمارانە، پەیوەندیی بە کورتیی و درێژیی ڕستەکانەوە هەیە، ئەگەرنا، مادام ژمارەی وشەو پیتەکان چەسپاوە، ناگونجێ لە ئەندازەو قەبارە (مقدار وحجم)ی قورئاندا، ڕاجیایی هەبێ.

www.alibapir.com





بە پارەی گەندەڵیی و حەرام كاردەكەن، كە بەس ئیشیان ئەوەیە خەڵك بخەنە دوودڵیی و گومانەوە، دەڵێ: كێ دەڵێ قورئان وەك خۆی بەئێمە گەیشتوە؟! برادەر! مسوڵمانانی دنیا، لە ڕۆژهەڵات تاكو ڕۆژئاوا، لە باكوور تاكو باشوور، لەسەر پیتێكی قورئان كێشەیان نیە! بێگومان جۆرە خوێندنەوەكان هەن، حەوت(٧) قیرائەتەكان، دە(١٠) قیرائەتەكان هەن، ئەوە دیارە، بەڵام، كەم و زیادیی پیتەكان، كێشەی لەسەر نیە و، سەرژمێر كراون، ئنجا ئەوە لە كوێ و ئەوە لە كوێ، كە من لە (پەیمانی كۆن) سێ نوسخەم لەلان، هەر نوسخەیەك لەوی دیكە جیاوازە!

ئنجا بێگومان: ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) جیا نیە لە قورئان، لێرەدا هەندێك خەڵك لێی تێكچووە، بەڵكو ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) واتە: پراكتیزەكردنی قورئان، جێبەجێ كردنی قورئان لەسەر ئەرزی واقیع، ئێمە ئەگەر بمانەوێ، ئیسلام بە تیۆریی (نظري) ببینین، ئەوە قورئان و، ئەگەر بمانەوێ بە تەتبیق كراویی ببینین، ئەوە پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) و ڕێبازەكەی! هەندێ كەس وادەزانێ كە سوننەت جیایە لە قورئان! نەخێر، كاكڵ و جەوهەرو ڕووحی سوننەت، بریتیە لە قورئان و، پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) شتێكی جیا لە قورئانی پێ نەبووە، بەڵێ بەتەئكید خوا وەحیی زیادەشی بۆ پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم) ناردوە، هەندێك شت پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) بە حەڵاڵی داناوە، یان بە حەرامی داناوە، بەڵام ئەویش هەمووی هەر دەچێتەوە نێو قورئان و، هیچی لەگەڵ قورئاندا تێكناگیرێ، (ابن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لە بەرگی یەكەم، لە كتێبی: (درء





www.alibapir.com





التعارض بين العقل والنقل)دا دەڵێ: هەموو دنیا لە سەنگ و سوژن بنێی، حەدیسێك نابینیەوە لە گەڵ قورئاندا دژ بووەستێ[1] و، هەر شتێك لەگەڵ قورئاندا دژ وەستا، فەرمایشتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نیە. کەواتە: ڕێبازی پێغەمبەر عليه الصلاة وسلام جیاواز نیە لە قورئان، بەڵکو ڕێبازی پێغەمبەر (سنة النبي) قورئانە بە تەتبیق کراویی و بەرجەستە کراویی لەسەر ئەرزی واقیع، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

{ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ } الأحزاب، ٢١.

واتە: بە دڵنیاییەوە لە پێغەمبەری خوادا، باشترین سەر مەشقیی هەیە بۆ ئێوە.



هەروەها خوای زاناو توانا دەفەرموێ:

{وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ } الحشر، ٧.

واتە: هەرچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێتان دەدا، لێی وەربگرن و، هەرچی ئەو لێتان قەدەغە دەکات، دەستی لێ هەڵبگرن.

هەروەها خوای تاك و پاك دەفەرموێ:

{وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ } النحل، ٤٤.

واتە: زیکرمان بۆ لای تۆ ناردوە، تاکو ئەوەی بۆیان دابەزێندراوە، بۆیان ڕوون بکەیەوە.

---

(١) ج١ ص ١٣٣، ١٨٧، ١٨٩.

www.alibapir.com





یانی: چۆنیەتی جێبەجێ کردنەکەی ڕوون بکەیەوە، لێتان تێك نەچێت، سوننەت بەو واتایە شەرحی قورئان نیە، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دانیشتبێ و ئایەت بە ئایەت تەفسیری بکات! هەموو ئەو ئایەتانەی هاوەڵانی ئیشکالێکیان لەسەریان بووبێ و، پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) قسە و شەرحی لەسەر کردبن، پێم وانیە بگەنە بیست سی(٢٠-٣٠) ئایەت، لەو هەموو شەش هەزار ئایەتە، چونکە هەمووی ڕوونەو، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: قورئان ڕوونە و ڕۆشنکەرەوەیە:

١- {تِلْكَ ءَايَـٰتُ ٱلْقُرْءَانِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ} الحجر، ١.

٢- {تِلْكَ ءَايَـٰتُ ٱلْقُرْءَانِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ} النمل، ١.

٣- {وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ} القمر، ١٧، ٢٢، ٣٢، ٤٠.



قورئان ڕوونەو پێویستیی بە تەفسیر ناکات، هەڵبەتە بۆ ئەهلی خۆی ڕوونە، بۆ کەسێك کە زمانی عەرەبی بزانێت، بەڵام کە ڕوونە، مانای وا نیە، کە هەموو کەس لە هەموو شتێکی تێدەگا، بەڵکو هیچ کەس ناگاتە ئەوپەڕی و، هیچ کەسیش نیە بەشی خۆی لێی حاڵیی نەبێ، گەورەیی و ئیعجازی قورئان لەوەدایە.

پوختەی قسان:

بە گەڕانەوەمان بۆ وەحیی و پەیامی خوا، کە لە قورئان و ڕێبازی پێغەمبەردا بەرجەستەیە، دەکەوینە سەر کانیاو و سەرچاوەی ڕوون و زوڵاڵی ئیسلام و، لە زۆرێك لەو قوڕ و لیتەو لاڵ و قەوزەو چی و چییە، دەربازمان دەبێ، کە بەدرێژایی ئەو هەموو سەدانە، لەگەڵ ئاوی ڕوون و زوڵاڵی وەحیی بێ خلتەی خوای بەرز و مەزندا، ئاوێتە بووە.

www.alibapir.com





## هەنگاوی چوارەم

## قورئان كردنە پێوەر و تەرازووی گرنگییدان بە مەسەلەكان

ئێستا ئەگەر تەماشای دینداریی مسوڵمانان بكەین، تەماشای بارودۆخی ئۆممەت بكەین، دەبینین: هەندێ شت زۆر گرنگیی پێدەدرێ و، سەرنج دەدەی لە قورئاندا هەر باسی نیە، لە سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یشدا باسی نیە! ئەدی مسوڵمانان لە كوێیان هێناوە!؟ لەڕاستییدا هەمووی عادەت و نەرێت و بۆچوونەو، هەڵقوڵاوی سروشت و میزاجە! یان هەندێك شت دەبینین لە قورئاندا، لە یەك شوێندا باس كراوەو، هەندێك شت دەبینین لە سەدان ئایەتدا باس كراوە، ئنجا ئێمە ئەگەر بە دوای ڕێبازی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و بە دوای پەیامی خوا بكەوین، دەبێ ئەم قورئانە بكەینە تەرازوو، خوا دەربارەی قورئان چی دەفەرموێ؟



{ ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ وَٱلۡمِيزَانَۗ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٞ } الشورى، ١٧.

واتە: خوا ئەو زاتەیە كە قورئانی دابەزاندوە بە حەق و، تەرازووشی دابەزاندوە.

سەرنجی تەفسیرەكانم دا، نەمبینی ئەو خوێندنەوەیان هێنابێ، بەڵام لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە دەگونجێ بشخوێندرێتەوە: {أَنْزَلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ وَالْمِيزَانِ}، دەشگونجێ بە (وَالْمِيزَانِ)یش بخوێندرێتەوە بە (خفض)، واتە خوا قورئانی بە هەق و بە تەرازووش دابەزاندوە،

www.alibapir.com



بەڵام ئەگەر بە (الْمِيزَانَ) - واتە: بەسەر (فتحة) - بخوێندرێتەوە، یانی: خوا کتێبی بە هەق دابەزاندوەو تەرازووشی هەر دابەزاندوە، کە بێگومان تەرازووەکەش هەر لەنێو قورئان دایە.

زۆر گرنگە ئێمە بزانین کە گرنگییدانی قورئان بە هەر شتێك، دیارە ئەو شتە لە تەرازووی خوادا و بە پێوەری وەحیی و شەریعەت: ئەوەندە دێنێ، ئەگەر زۆرتر گرنگیی پێ بدات، دیارە زۆرتر گرنگەو، کەمتر باسی بکات، دیارە کەمتر گرنگە، چونکە خوا قورئانی بە حەق و بە تەرازوو ناردوە، یان تەرازووشی لەگەڵ دا ناردوە.

هەروەها لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ:

{وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا} الأنعام ئایەتی، ١١٥.





واتە: وشەی پەروەردگارت تەواوی کردوە، لە ڕاستیی و لە دادگەرییدا.

وشەی پەروەردگارت واتە: ئایەتەکانی خوا لەڕاستبووندا، تەواویان کردوەو، لە لووتکەی دادگەرییدان و، لە لووتکەی تێرو تەواوییدان.

لە سوورەتی (الإسراء)یشدا، خوا دەفەرموێ:

{وَبِالْحَقِّ أَنزَلْنَاهُ وَبِالْحَقِّ نَزَلَ} الإسراء، ١٠٥.

واتە: قورئانمان بە هەق {بەشێوەیەکی هەق} دابەزاندوەو، هەقیشی لەنێو خۆی وەرگرتوە.

دابەزاندن (إنزال)ەکەی بە هەقەو، کە داشبەزیوە، هەقی تێدایە.

با چەند نموونەیەك بێنینەوە:

www.alibapir.com




١) ئایا لە چەند ئایەتاندا، خوا باسی یەكتایی خۆی دەكا، كە تەنیا خوا بەدیهێنەر و، پەروەردگار و، خاوەنەو، تەنیا خوا دەبێ بەندایەتیی بۆ بكرێ و بپەرسترێ؟ بێگومان لە زۆر ئایەتاندا، هەر تەماشای سوورەتی (البقرة) بكەین، كە سوورەتێكی مەدینەییشە: گەورەترین ئایەت لە قورئاندا (آية الكرسي)یە، كە باسی خوابەیەكگرتن(توحيد الله)یە، لە دە(١٠) برگەدا:

{ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ } البقرة:٢٥٥.





ئنجا سوورەتە مەكەییەكان، هەموویان بەزۆریی تەرخان كراون، بۆ باسی یەكتایی خواو خواپەرستیی.

٢) لە چەند ئایەتاندا باسی دادگەریی كراوە؟ بێگومان لە زۆر ئایەتاندا، بۆ نموونە:

{إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ } النحل، ٩٠.

٣) لە چەند ئایەتاندا باسی تەقوا كراوە؟ بێگومان لە زۆر ئایەتاندا، بۆ نموونە:

{يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ ...} النساء-١-.

هەروەها باسی ئیحسان، یان باسی یەكڕیزیی و یەكبوون(وحدة)؟ بێگومان لە زۆر ئایەتاندا باسكراون، ئەدی لە چەند ئایەتاندا باسی

www.alibapir.com



سەرپۆشی ئافرەت كراوە؟ لەیەك ئایەت، لە سوورەتی (النور)دا: {وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ} النور، ٣١.







كەواتە: ئافرەت لەسەری پێویستە و دەبێ سەرپۆشی بەسەرەوە بێ، بەڵام ئایا ئەندازەی گرنگیی و پێگەی سەرپۆش بەسەرەوە بوونی ئافرەت، لەبەرانبەر تەنیا خواپەرستییدا، یان: چەسپاندنی دادگەرییدا، یان: ڕیشەكێشكردنی زوڵمدا، یان: بۆ خوا سوڵحان و پارێزكاریی و چاكەكارییدا، چەندە؟ بەدڵنیایی شتێكی بچووكە، بۆیە كاتێك هەموو ئیسلام و شەریعەت، لە جێبەجێ كردنی یاسا شەرعییەكانداو، ئەویش لە سەرپۆش كردن و، ڕیش هێشتنەوەدا، خوڵاسە بكرێتەوە، بە ڕاستیی ئەوە زوڵمە لە ئیسلام دەكرێ! زوڵمە لە ئیسلام دەكرێ، چونكە خوا وای دانەناوە، گرنگە هەر بابەتە گرنگیی و بایەخیی پێبدرێ، بەقەدەر ئەوەی كە قورئان گرنگیی پێداوە، ئەوەندەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خەمی لێ خواردوەو مشووری لێ خواردوە.

ئێستا تەماشا بكەن! ئێوە دەزانن من مەشرەبم فراوانەو، بۆنەی مەولید و هەموو بۆنە و یادە ئایینیەكان، جیهانییەكان، پیشەییەكان،

www.alibapir.com



مرۆییەكان، پێم وایە ئەسڵ تێیاندا ڕەواییە[1] ، بەڵام لە شارێكی وەك هەولێر لەگەڵ مانگی ڕەبیعی یەكەم دێ، ئیدی ئەو خەڵكە هەمووی زۆر موشەووەش دەبێ! چییە؟ مەولیدی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)! زۆر باشە شتێكی ڕەوایە و موباحە، ئەگەر بە شێوەیەكی شەرعیی بكرێ، شتێكی ئاساییەو هەڵسوكەوتێكی مسوڵمانانەو دەیكەن، چونكە ئەگەر بگوترێ: عیبادەتە، ئەوە دەچێتە نێو بازنەی بیدعەت، چونكە هەر عیبادەتێك لە دوای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) پەیدا كرابێ، بیدعەتە، بەڵێ یادكردنەوەی لەدایكبوونی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) عیبادەت نیەو، تەنیا هەڵسوكەوتێكە، وەك دایكمان عائیشە -خوا لێی ڕازی بێ- لە بارەی شیعرەوە پرسیاریان لێ كردوە، وەڵامێكی زۆر عاقڵانەی داوەتەوە، كە شایستەی خۆیەتی، دەڵێ: (الشِّعْرُ كَلامٌ، حَسَنُهُ حَسَن، وَقَبِيحُهُ قَبِيح) شیعر قسەیە، چاكەكەی چاكە و، خراپەكەشی خراپە، هەڵسوكەوتەكانیش سەیر دەكەین بزانین چۆنن؟ ئەگەر باش بوون، باشن و، ئەگەر خراپ بوون، خراپن.



117

بەڵام چەندان فەرز هەن، لە هەولێر و سلێمانی و دهۆك و هەڵەبجە و كەركووك و، لە شوێنەكانی دیكەی كوردستان و عیراق، چوێندراون، مسوڵمانان چەندیان خەمی لێ دەخۆن! یاد كردنەوەی لە دایكبوونی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) عادەت و نەریتێكی مسوڵمانانەو، لە بواری هەڵس و كەوتەكان دایە، كە بناغە تێیاندا ڕەوایی و دەستكراوەیی (الإباحة)یە، هەرچەندە وشەكەش بە هەڵە

---

(1) كتێبێكی تایبەتم لەوبارەوە نووسیوە، بەناوونیشانی: (یادو بۆنەو جەژنەكان و هەڵسەنگاندنێك).

www.alibapir.com




دەڵێن، دەڵێن: (مەولوودی پێغەمبەر) (صلى الله عليه وسلم)، (مولود) یانی: لە دایکبوو، (مَوْلِد) واتە: کاتی لە دایکبوون، ئنجا بە ئەندازەی ئەوە کە شتێکی باشە، گرنگیی پێبدە، بەڵام با لەسەر حیسابی شتی دیکە نەبێ، لە بازاڕەکەت شەڕاب دەفرۆشرێ، وەك بیبسی و کۆلا، لە بازاڕەکەت قۆڵی خەڵك دەبڕێ، گەندەڵیی هەیە! زوڵم هەیە! فەساد هەیە! تۆ مووت لێنالەخشێ! بەڵام مەولید هاتوە، خۆت زۆر مشەووەش کردوە!!

ئەوە هەمووی لاتەڵ تێگەیشتنە لە ئیسلام و، نەکێشانی شتەکانە بە تەرازووی قورئان و، هەڵنەسەندگاندنە، بە پێوەری قورئان و وەحیی خوای پەروەردگار.





یان بۆ وێنە: لەچەند ئایەتاندا باسی خواپەرستیی و بەندایەتیی بۆ خوا کراوە؟! بێگومان زۆر! لەچەند ئایەتاندا باسی نوێژ کراوە؟ دیسان زۆر! بەڵام لەچەند ئایەتاندا باسی دەستنوێژ کراوە؟ تەنیا یەك ئایەت! بۆچی؟ چونکە دیارە ئەوەندە گرنگە، دەستنوێژ بگرە بۆ هەموو فەرزەکان، بەڵام بەقەدەر خۆی گرنگە، بەڵام ئایا زانایانی ئێمە وایان کردوە؟ نەخێر، بەڵکو کتێبی زۆریان داناون لەسەر غوسڵ و دەستنوێژ، بەڵام ئایا چەند کتێبیان داناون لەسەر ئەوە، کە ئایا دەبێ مسوڵمانان چۆن کۆمەڵگاو وڵاتی خۆیان بەڕێوەبەرن! چۆن ئەم ئایەتە: {وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ} کارا (تفعیل) بکەین و پراکتیزەی بکەین؟ ئێمە کەلەپووری سیاسەتی شەرعییمان، زۆر هەژارە، بەڵام شتی دیکەمان زۆر قەبە کردوە، غوسڵ و دەستنوێژ لە یەك ئایەتدا باسکراون! زۆر کەس لە ئەنجامی ئەو هەموو وردەکاریی و وردبوونەوەیەدا، لە غوسڵ و دەستنوێژدا وەسوەسەی بۆ دروست

www.alibapir.com





بووە، یاخود لە نیەت هێنانی نوێژدا، مامۆستام دیوە ماوەیەك خەریکی نیەت هێنان بووە! بۆیەش وەسوەسەی بۆ دروست بووە، چونکە لە هەندێك کتێباندا هاتوە، کە دەبێ لە ئەلیفی (أَللّه) تاکو ڕای (أكبر) بەدڵتدا بێ: چ نوێژێکە دەیکەی و، چەند ڕکاتەو، لەگەڵ کێیەو...هتد؟! لەکوێت هێناوە؟ ئەو وردەکارییە لە کوێیە؟ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) (أَللّه أكبر)ی کردوەو نوێژی دابەستوەو تەواو! بێگومان ئەو وردەکاریی و شیتەڵکردنەوەیە، لەسەر حیسابی شتەکانی دیکەیە، وەك لە یاداشتەکانی خۆمدا[1] باسم کردوە، گەنجم بینیوە نوێژی نەکردوە، گوتوومە: بۆچی نوێژ ناکەی؟ گوتوویەتی: ئاخر فێر نەبووم! فێری چی نەبووی؟ فاتیحە نازانی؟ با! تەحییات نازانی؟ با! ئەدی چی نازانی؟ دوعایەکانی دەستنوێژێ نازانم! کام دوعایانە؟ ئەوەی کە دەم و چاوت دەشۆی، ئنجا کە دەستەکانت دەشۆی و، کە مەسحی سەرت دەکەی و، کە پێیەکانت دەشۆی و، دوعایان هەیە! گوتم: ئەوانە هیچیان نەك هەر واجب نین، هەر سوننەتیش نین، ئیمام نەوەوی لە کتێبی (المنهاج) دا دەڵێ: (وَحَذَفْتُ دُعاءَ الأعضاءِ إذْ لا أَصْلَ لَهُ)[2]، واتە: ئەو دوعایەی ئەندامەکانی دەستنوێژ، هیچ شتێکی لەبارەوە لە پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وسلم) نەهاتوە! یانی: لەسەر شتێك کە ئەسڵی نیە، کابرا فەرزێکی چواندوە!

بەڵێ زۆر گرنگە قورئان بکەینەوە تەرازوو، بیکەینە پێوەر بۆ شتەکان، چەندە گرنگیی بە هەر شتێك داوە، ئەوەندەو بەو ئەندازەیە

---

(١) چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم، بەشی یەکەم: ١٩٦١-١٩٩١ز.

(٢) مغني المحتاج، شرح المنهاج، ج١ ص ١١٣.

www.alibapir.com





گرنگیی بێبدەین، کەمتر کەمتر و، زیاتر زیاتر، شتێکیش لە قورئاندا هیچ باس و خواسی نیە، لە خۆڕا لەسەر دین نەیکەینە بار و، نەیکەینە بەشێك لە دینداریی، بۆ وێنە: باسی نیقابی ئافرەتان، پێچە گرتنەوەی ئافرەتان، لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، ئافرەت هەبوو نیقابی هەبوو ، هەشبوو نەیبوو ، نەشیان کردوە بە هەرا، لە هەندێك لە وڵاتانی کەنداو، کە ڕێگا نادەن کەس ڕەخنە لە حکومڕانێك بگرێ، کە عیباد و بیلادی کردۆتە کۆیلە، بەڵام واجبە دەبێ ئافرەت پێچەی هەبێ و، ئەگەر دەموچاوی دیار بێ، ئەوە لە دین لای داوە! جارێك لەسەفەری عومرە یان لە حەج بووم، کچێك کە باڵغ نەبوو بوو، سەرپۆشی بەسەرەوە نەبوو، دوو سێیەك لەو عەگال بەسەرانەی[1] وێ، لەگەڵی کەوتنە کێشەو، کچەکە گریا، ئەویش بابی لەگەڵی بوو، گوتی ئەوە چییە بۆچی وا لەم کچەم دەکەن، تۆقانتان! ئەوانیش دەیانگوت: ئاخر چۆن دەبێ ئاوا هاتوە، لەگەڵ حورمەتی بەیتدا ناگونجێ! بابیشی گوتی: جارێ تەکلیفی شەرعیی لەسەر نیەو بەو شێوازەی ئێوەش دین لەبەرچاوی دەبێزرێ، کردیان بە هەرایەك ئەوسەری دیار نەبوو! کە بێگومان ئەوە هەمووی کرچ و کاڵ و لاتەڵ حاڵیبوونە لە دین، ئەو دووسێ پیاوەی سعوودیە دینیان هەموو لەوەدا دەدی، کە ئەو کچە نابالغە سەرپۆشی بە سەرەوەبێ! بەڵام ئایا ئەگەر ئەو منداڵە دڵی خۆشبکەی، ئامۆژگاریی بکەی، دینی لەلا شیرین بکەی، ئەوەش هەر دین نیە؟ ١٢٠




---

(١) مەبەستم لە (عەگال بەسەر) یەکەم تەماشاکردنی جل و بەرگی ئێستای حیجاز نیە، بەڵکو مەبەستم پیاوانێکی تایبەتە کە سەربە موخابەراتی ئەو وڵاتەن!

www.alibapir.com





## هەنگاوی پێنجەم

## بیركردنەوەو بەكارهێنانی عەقڵ و هەستەوەرەكان، لە تێفكرین و سەرنجدانی هەردوو كتێبی خوێنراو و بینراوی خوادا

خوا دوو كتێبی خستووینە بەر دەست، كتێبێكیان خوێندراوەیە، كە قورئانە (كتاب الله المقروء)، ئەوەی دیكەش ئەم گەردوونەیە، كتێبی بینراوی خوا (كتاب الله المنظور)، ئنجا لە ئەنجامی ئەوەدا كە مسوڵمانان لە پەیام و وەحیی خوا دووركەوتوونەوە، عەقڵی خۆیان لەكار خستوە، هەم لە سەرنجدانی كتێبی خوێنراوی خواو، هەم كتێبی بینراوی خوادا، سەرنج بدەن! ئێستا چەندان بیروڕا هەن، مسوڵمانان پێیانەوە پابەندن، كە هەزار (١٠٠٠) ساڵ لەمەوپێش، هەزار و دووسەد (١٢٠٠) ساڵ لەمەو پێش كەمتر یان زیاتر، گوتراون، كە بێگومان مەبەستم بوارەكانی بووںناسیی و، ئیمان و عەقیدە و، پەرستشەكان نیە، مەبەستم بواری هەڵسوكەوتەكانە، بۆ وێنە: ئەو شێوە بازرگانیی و مامەڵەیەی ئێستا دەكرێ، پشكەكان(أسهم) و شیكەكان(سندات) و سندووقی نێو دەوڵەتیی و، بانكی نێو دەوڵەتیی، ئایا كاتی خۆی زانایانی ئێمە بە خەونیش شتی وایان بینوە؟ نەخێر ، ئایا نابێ چاو بە شێوەی مامەڵەی بازرگانییدا بگێڕدرێتەوە؟ بە دڵنیاییەوە، با.


١٢١


بۆیە دەتوانین بڵێین: ئەم ئۆممەتە بەزۆریی مەحكوومی فەتوا و بیروڕای زانا مردووەكانیەتی، بۆیەش ئۆممەت بە مردوو حیسابە! لە هەموو لایەكەوە دوژمن سەریان تێناوە، وەك چۆن كەلاكێك دەكەوێت،

www.alibapir.com



داڵ و لاشخۆر تێیدەورووكێن و گۆشتەكەی دەخۆن ، ئێستا ئۆممەت وایە بەداخەوە! بۆچی مردوە؟ چونكە عەقڵی خۆی لە كارخستوەو، ئێستا لەنێو ئۆممەت دا مردووان حوكمی زیندووان دەكەن! هەڵبەتە ئەو فەتوا و ڕایانەی، كاتی خۆی لە كتێبەكاندا نووسراون، زانایان بۆ سەردەمی خۆیان، شتێكی باشیان كردوەو خراپیان نەكردوە، بەڵام بۆ سەردەمی خۆیان و، ئەو وەڵامانە هی پرسیارەكانی سەردەمی خۆیان بوون و، بە كەڵكی پرسیارەكانی سەردەمی ئێستا نایەن، ئەو دەرمانانە بۆ نەخۆشییەكانی سەردەمی خۆیان گیراونەوە، دەرمانخانەكەش هەر هەیە، كە قورئان و سوننەتە، تۆش ئازا بە، دووبارە بۆ نەخۆشییەكانی ڕۆژگاری خۆت، دەرمانی تازە بگرەوە، دەرمانێك كە لەگەڵ ئەو نەخۆشییانەی سەردەمی تۆدا پڕ بە پێست بێ، نەك چارەسەر و دەرمانە كۆنەكان، بۆ نەخۆشییە تازەكان بەكار بێنی و، وەڵامە كۆنەكان بۆ پرسیارە تازەكان بەكاربێنی! چونكە ئەوكاتە ئیسلام چۆن دەكەوێتە بەرچاو؟ دەڵێن: دین لە ژین بەجێ ماوە، كە بەڕاستیی ئەوە مسوڵمانانن بەجێ ماون! ئەگەر نا ئیسلام ئەگەر خوای پەروەردگار هەر بۆ ئەو كاتی ناردبووایە و، تەنیا بۆ وڵاتێكی ناردبووایە، مسوڵمانانی پێوە پەیوەست نەدەكرد، كە لە هەموو كات و ڕۆژگارەكاندا پێیەوە پابەند بن، بەڵام دیارە خوا سبحانە وتعالی ئیسلامی وا هەڵخستوە، كە دەگونجێ وەك چۆن كێشەو گرفتەكان كاتی خۆی چارەسەر كردوون، ئەوانەی ئێستاش چارەسەر بكات، بەڵام بەچی؟ بە وەحیی بەرجەستە لە قورئان و سوننەتدا، نەك فلان مەزهەبە و فلان ئیجتیهادە و، فلان فەتوایە و فلان بۆچوونە! ئەوە لەگەڵ ڕۆژگاری خۆیدا بووەو بەكەڵكی ڕۆژگاری خۆی هاتوە، بەڵام وەك چۆن دەرمان ئێكسپایەر دەبێ و





www.alibapir.com



لەكار دەكەویٚ، بیروبۆچوون و فەتوا و ئیجتیهادەكانیش، بە هەمان شێوە، زۆر جار ئەوەم هێناوەتە بەرچاوی خۆم: ئەگەر ئێستا، نەك كەسێكی هەزار(١٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش، هەر هی سێ سەد(٣٠٠) ساڵ لەمەو پێش، بە بەرگ و پۆشاكی ئەو كاتی و، بە چەكی ئەو كاتی بێ، بەبازاڕدا بڕوا، خەڵك چۆن سەیری دەكەن! هەموو سەریان سوڕ دەمێنێ! ئنجا لە ڕاستییدا ئێمە وەك چۆن كەل و پەلەكانمان كۆن دەبن و دەگۆڕێن و گۆڕیومانن، بە هەمان شێوە بیركردنەوەكانیش، ئەو بەشەی پەیوەندیی بە ژیانی دنیاوە هەیە: پەیوەندیی بە بواری سیاسەت و حوكمڕانیی و، بواری هەڵسوكەوتی ئابووریی و بازرگانیی و ئەوانەوە هەیە، دەگۆڕێ، بەڵام ئەوەی پەیوەندیی بە خودی دینەوە هەیە، وەك بوونناسیی و ئیمان و عەقیدە و عیبادەت و پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و خوا، ئەوە ناگۆڕدرێ و وەك خۆیەتی، چونكە پەیوەندیی بە ڕاستییە نەگۆڕەكانی بوون (حقائق الوجود الثابتة) و ڕووح و جەوهەری ئینسانەوە هەیە، بەڵام ئەوەی پەیوەندیی بە لایەنی ماددیی ژیانەوە هەیە، دەبێ بگۆڕدرێ و چاوی پێدا بخشێندرێتەوە، ئەگەر نا، ئەو كاتە ئێمە ستەم لە ئیسلام دەكەین و، خەڵك دەڵێن: دین لە ژین بەجێماوە، كە لەواقیعدا، ئەوە مسوڵمانانن كە لە دینەكەیان بەجێماون.





هەر بۆیەش لە زۆر شوێنی قورئاندا، خوای زانا و شارەزا سەرزەنشتی كافرەكان دەكات، كە گوتوویانە: شوێن ئەوە دەكەوین كە باب و باپیرانمان لەسەری بینیوە، پێشینانمان لەسەری بینیوە، بۆ وێنە:

١- { بَلۡ قَالُوٓاْ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهۡتَدُونَ } الزخرف، ٢٢.

www.alibapir.com




واتە: یان ئایا پێش وی (قورئان) کتێبێکمان پێداون و پێیەوە دەستگرتوون؟ بەڵکو گوتیان: ئێمە باب و باپیرانمان لەسەر ڕێیەك بینیوە، تەنیا بەدوای شوێنەوارەکانی وانیش دەکەوین.

٢- بەهەمان شێوە هەر لە سووڕەتی (الزخرف)دا دەفەرمویٚ:

{وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ} الزخرف، ٢٣.

واتە: هەر بەو شێوەیە: لەپێش تۆدا هیچ ترسێنەر و وریاکەرەوەیەکمان لە هیچ ئاوەدانییەکدا نەناردوە، مەگەر خۆشگوزەرانەکانی گوتوویانە: ئێمە باب و باپیرانمان لەسەر ڕێبازێك بینیوە، تەنیا بەدوای ڕێ و شوێنی وانیش دەکەوین.



٣- هەروەها خوا سەرزەنشتی کافرەکان دەکات و دەفەرمویٚ: ئەگەر پێیان بلێی: وەرن شوێن پەیامی خوا و ڕێبازی پێغەمبەر بکەون، دەڵێن: نا باب و باپیرانمان چۆن بوون، ئێمەش هەر وا دەبین و وا دەکەین، موشریکەکان وابوون، کەواتە: ئێستا زۆرێك لە مسوڵمانان وەك موشریکان دەکەن! خوا فەرموویەتی:

{وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ قَالُواْ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ} المائدة، ١٠٤.

واتە: ئەگەر پێیان بگوترێ: وەرن بۆ لای ئەوە کە خوا دایبەزاندوە، بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، دەڵێن: ئەوەمان بەسە، کە باب و باپیرانمان لەسەری بوون، ئەدی ئەگەر باب وباپیرانیان هیچیان نەزانیبێ و ڕێی ڕاستیان نەگرتبێ!

www.alibapir.com




٤- هەروەها لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ:

{وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْئًا وَلَا يَهْتَدُونَ} البقرة، ١٧٠.

واتە: ئەگەر پێیان بگوترێ: بە دوای ئەوە بکەون کە خوا بۆی دابەزاندوون، دەڵێن: بەڵکو دوای ئەوە دەکەوین کە باب و باپیرانمان لەسەری بوون، (خواش دەفەرموێ): ئەدی ئەگەر باب و باپیرانیان هیچیان نەفامیبێ و ڕێی ڕاستیان نەگرتبێ؟

وەك دەبینین: لەو هەموو ئایەتانەدا -کە هی دیکەش هەن-، خوای کاربەجێ و زانا، سەرزەنشت و لۆمەی کافر و موشریکەکان دەکات، لەسەر دۆگمایی فیکریی و کەللەوشکیی و داخراوییان، لە بەرانبەر وەحیی و پەیامی خواو، ڕێبازی پێغەمبەردا، کە بێگومان ئەمە گەورەترین هۆشداریی تێدایە بۆ مسوڵمانان، بۆ ئۆممەتی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) کە لە خۆیان وریابن و کارێك نەکەن و هەڵوێستێك نەنوێنن، کە بیانخاتە ڕیز و ئاستی کافر و هاوبەشدانەرانەوە، لەو خەسڵەتە خراپ و بەدەی: لاساییکردنەوەی کوێرانەی پێشینیاندا!





بەڵێ هەموو بوارەکانی کە فیکری بەشەر مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، گۆڕان و پەرەستاندنیان بەسەردادێ، من باسی: بووناسیی و، ئیمان و عەقیدە و، عیبادەت و ئەو لایەنە ناکەم، کە بە خوای تاك و پاك و بە ڕووح و جەوهەری مرۆڤەوە پەیوەستەو گۆڕانی بەسەردا نایەت، ئەو لایەنە هەر وەك خۆیەتی و، لەڕاستییدا ئەو هەموو ئیجتیهاد و فەتوایەشی نەدەویست، کە زۆر ئیسلامی پێ قەڵەباڵغ

www.alibapir.com





كراوە! بەڵام ئەوەی دیكە، كە پەیوەندیی بە لایەنی ماددیی ژیان و حوكم و سیاسەت و ئیدارەوە هەیە، ئەوە بە دڵنیاییەوە، دەبێ ڕۆژ بە ڕۆژ و، ساڵ بۆ ساڵ و، جار بۆ جار، چاوی پێدا بگێڕدرێتەوە.

ئەگەر تەماشای قورئان بكەین، دەبینین: خوای پەروەردگار زۆر فەرمان بە مرۆڤەكان دەكات سەرنج بدەن: سەرنجی گەردوون بدەن، سەرنجی خۆیان بدەن، سەرنجی خواردنیان بدەن، جگە لەوەی كە لەچەندان ئایەتدا فەرمانمان پێ دەكات: سەرنجی قورئان بدەین، لێی ورد بینەوە و لێی بكۆڵینەوە، بۆنموونە:

١- {كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ} ص-٢٩.



واتە: ئەمە كتێبێكی بەپیزە بۆ لای تۆمان دابەزاندوە، تاكو لە ئایەتەكانی ڕامێنن و، بۆ ئەوەی عاقڵمەندان پەندی لێوەربگرن.





٢- {أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ} محمد، ٢٤.

واتە: ئایا لە قورئانێ وردنابنەوە، تێی نا فكرن، یان دڵەكان قفڵیان لێدراوە!!

ئنجا با سەرنجی چەند ئایەتێك بدەین، وەك نموونە، كە خوای پاك و تاك (عزوجل) تێیاندا فەرمان بە مرۆڤان دەكات و هانیان دەدات، سەرنجی خۆیان و دەوروبەر و گەردوون بدەن و، لێیان وردبنەوەو، هەوڵبدەن، پەی بە نهێنییەكانی ببەن:

٣- {قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ} العنكبوت، ٢٠.

واتە: بڵێ: بە زەویدا بڕۆن، گەشت بكەن و سەرنج بدەن، خوا چۆن دروستكراوەكانی دەست پێكردوون!!

www.alibapir.com





٤- {قُلْ سِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ} النمل-٦٩-.

واتە: بڵێ: بە زەویدا بڕۆن و سەرنج بدەن: سەرەنجامی تاوانباران چۆن بوو؟!

٥- {قُلْ سِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ ثُمَّ ٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ} الأنعام:١١.

واتە: بڵێ: بەزەویدا بڕۆن (گەشت و سەفەر بكەن)، پاشان سەرنج بدەن: ئاكامی بێبڕوایانی بەدرۆدانەر چۆن بوو!!

٦- { أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيْءٍ } الأعراف-١٨٥-.







واتە: ئایا سەرنجی موڵكی فراوانی ئاسمانەكان و زەوییان نەداوە، هەروەها هی هەر شتێك كە خوا دروستیكردوە؟!

٧- {فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ} عبس، ٢٤.

واتە: با مرۆڤ سەرنجی خواردنەكەی بدات و لێی وردبێتەوە!

٨- {وَفِي ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِيٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾} الذاريات.

واتە: لە زەویدا نیشانە زۆرن بۆ زانایانی دڵنیاو بەرچاوڕوون، هەروەها لە خودی خۆشتاندا، بۆچی نابینن، سەرنج نادەن؟!

بەداخەوە: زۆربەی هەرەزۆری مسوڵمانان، ئەو هەموو ئایەتانەیان پشتگوێ خستوون و، عەقڵ و هۆشی خۆیان لەو بوارەدا داخستوەو خەواندوە، هەر بۆیەش ئەهلی كوفر زۆرێك لە نهێنیی و یاسا گەردوونییەكانیان دۆزینەوەو، پێشیان بەرەو پێش چوون و، ژیانی

www.alibapir.com




خۆیانیان پێ چاك کردون، هەیمەنەشیان بەسەر دنیادا کرد، مسوڵمانانیش بەداخەوە دوای ئەوەی کە لە وەحیی دووركەوتنەوە، ئاوا تووشی بەجێماویی و داماویی بوون، ئەگەرنا کاتی خۆی ئێمە وابووین، - واتە: لەپێشەوە بووین و سەرقافڵەی مرۆڤایەتیی بووین - ئەهلی ئیسلام، ئۆممەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەتا لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سونەتدا مامەڵەی دەکرد، لەگەڵ هەردووك کتێبی بینراوو خوێنراو(منظور ومقروء)ی خواداو، عەقڵی خۆی بەکار دەهێنا لە تێگەیشتنی قورئان و سوننەت (وەحیی خوا)داو، لە سەرنج دان و ناسینی گەردووندا، مسوڵمانان لە پێشەوەی دنیاوە بوون.





لە ڕێی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## هەنگاوی شەشەم
## ژیان لە واقیعدا، نەك لە مێژوودا

لە دوو شوێندا خوای زانا و توانا، لە سووڕەتی (البقرة)دا، ئەو ڕاستییەی دووبارە کردۆتەوە، کە مسوڵمانان پێویستە لە واقیعدا بژین، نەك لە مێژوودا:

{تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ} البقرة-١٣٤،١٤١.







خوا (عزوجل) پێشیٚ باسی خاوەن کتێبەکان دەکات، دوایی دەفەرمویٚ: ئەوانە کۆمەڵێك بوون ڕابردوون، هەرچی کردوویانە لە چاکە هی خۆیانە، ئێوەش هەرچی بیکەن لە چاکە، هی خۆتانەو، لێتان ناپرسرێتەوە لەسەر ئەوەی کە ئەوان کردوویانە.

ئەمە زۆر گرنگە کە ئێمە لە واقیعی خۆماندا بژین، هۆکاری زۆربەی کێشە و گرفتی مسوڵمانان، هی ئەوەیە کە لە مێژوودا دەژین، نەك لە ئێستاو لە واقیعدا، بەڵکو مێژوو هەڵدەکۆڵن و دەیهێننەوە بۆ ئێرە!! بە ڕاستیی سەرسوڕهێنەرە، ئێستا لەم ڕۆژگارەدا: بە ناوی شوێنکەوتنی سەلەفی ساڵحەوە، خەڵکی سەرگەرم بکەی بپرسی: ئایا قورئان مەخلووقە، یان مەخلووق نیە؟! ئێمە ئێستا کەی کێشەمان ئەوەیە؟! وەختی خۆی ئیمام (أحمد) ڕەحمەتی خوای لێبیٚ و، زانای دیکەش هەبوون بڵێن: قورئان مەخلووق نیە، هەندێکیش بەتایبەت ڕەوتی موعتەزیلە گوتوویانە: مەخلووقە،

www.alibapir.com


بەڵام بەهەر حاڵ، ئێمە ئێستا کێشەمان لەگەڵ ئەوانەیە کە دەڵێن: قورئان هەر فەرمایشتی خوا نیە! تۆ دەبێ واقیعی خۆت بزانی، ئێستا کوا کێشەی ئێمە ئەوەیە! کوا ئێستا کێشەیەکی گەورەیە، چوار مسوڵمان بچن لە قەبرێك بپارێنەوە؟! بێگومان دەزانم پاڕانەوە لە قەبر شیرکە و شیرکێکی گەورەشە، بەڵام ئێستا کێشەی گەورەمان ئەوەیە کە خەڵك خاوەن قەسر دەپەرستێ، نەك خاوەن قەبر! هەتا بەهۆی خاوەن قەبرێکەوە چوار مسوڵمانی عەوام و فەقیرحاڵ تووشی شیرکی گەورە دەبن، بە هۆی خاوەن قەسرێکەوە، بە ملیۆنان خەڵك لە ئیسلام دەردەچێ و هەڵدەگێردرێتەوە!

هەڵەی (محمد بن عبدالوهاب) و شوێنکەوتووەکانی لەوەدا بووە[1]، وەك لە کتێبێکی خۆیدا باس دەکات و لەخۆمەوە قسە ناکەم، دەڵێ: موشریکەکانی ڕۆژگاری ئێمە، (واتە: مسوڵمانانی گیرۆدەبوو بە شیرکەوە) لە موشریکەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خراپترن[2]، چونکە ئەوانیش هەر گوتوویانە:



{مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ} الزمر، ٣.

کە بێگومان ئەوە قسەیەکی پووچ و بێ ویژدانانەیە، بەرانبەر بە مسوڵمانانێکی ئەهلی قیبلەی لادەر و ناحاڵیی، چونکە کافرەکان هەر بەڕاستیی بت و صەنەمەکانیان پەرستوون، بەڵام بابای مسوڵمان، خوا

---

(١) واتە لەوەدا کە تەنیا شیرکی خاوەن قەبرانی دیوە، لە هی خاوەن قەسران بێ ئاگا بووە! هەڵبەتە دەمزانی باسی (طاغوت)یشی کردووە، بەڵام بەکردەوە تەنیا سەرگەرمی دژایەتیی و کوشتن و بڕین بووە لەگەڵ ئەوانەدا کە بەشیرك گۆڕان (شرك القبور) ناوزەدی کردوون.

(٢) بڕوانە: كشف الشبهات، ص٣٩.

www.alibapir.com




دەپەرستیٚ و جۆرێك لە چاوەڕوانییشی هەیە لەو خاوەن قەبرە و بە هەڵە لێی دەپاڕێتەوە، کە ئەوە شیرکە، بەڵام لە ئەسڵدا خوا دەپەرستیٚ و، ئەوەی دیکە (بتپەرست) لە ئەسڵدا بت دەپەرستیٚ، ئەدی چۆن دەڵێی: وەك یەکن! ئنجا بۆ زانیارییتان! (محمد بن عبدالوهاب) دەوڵەتی عوسمانیی هەموو بە کافر داناوە، جگە لەوەی لەگەڵ خۆی بووە، هەمووی بە کافر داناون!! هەروەها گوتوویەتی: زانایانی میسر و شام و عیراق و تورکیا و خۆراسان و حیجاز و...هتد. لەدوای سەدەی چوارەمەوە، کەس مسوڵمان نەماوەو هەموویان ئەهلی شیرك و کوفرن![1] هەروەها ڕایگەیاندوە: هەر کەسیٚ دێتەوە گەڵ ئێمە، ئەوە دەبێتەوە مسوڵمان! لەدوای خۆی شوێن کەوتووەکانی نامەیەکیان نووسیوە بۆ زانایانی مەککە و مەدینە (حرمین) و ئیجباریان کردوون بڵێن: ئێمە ئیقرار دەکەین، کە تاکو ئێستا لەسەر کوفر و شیرك بووین، لەمەودوا دێینە نێو ئەو دینەی موحەممەدی کوڕی عبدالوەهابەوە![2] کە ئێستاش لەگەڵ دا بیٚ، ئێمە بە دەست زۆرێك لەو بیرۆکانەوە گرفتارین!





---

(١) الرسائل الشخصية/ ١٥-١٠١، هەروەها: (تأريخ نجد) لابن غنام، ص١٣، ١٤، کە لە باسی سەرەتای سەرهەڵدانی بانگەوازی (ابن عبدالوهاب)دا: بەمجۆرە باسی حاڵ وباڵی مسوڵمانان دەکات، لەسەرەتای سەدەی دوازدەیەمی کۆچیی و لەڕۆژگاری دەوڵەتی عوسمانیی دا:

(كان أكثر المسلمين قد ارتكسوا في الشرك وارتدوا إلى الجاهلية وانطفأ في نفوسهم نور الهدى لغلبة الجهل عليهم واستعلاء ذوي الأهواء..... فنبذوا كتاب الله وراء ظهورهم...).

شایانی باسیشە (الشيخ حسين بن غنام) یەکێك بووە لە قوتابییە نێزیکەکانی (ابن عبدالوهاب) و مێژوونووسی ناوداری جووڵانەوەکەشە.

(٢) بڕوانە: (الدرر السّنيّة في الأجوبة النّجدية)، ج١، ص٣١٤.

www.alibapir.com




چەند تاوانێکی گەورەو لادان (إنحراف) و بەلارێدابردن (تحریف)ێکی مەزن و بێڕەزایەو، چەند ناشیرینکردن و بێزراندنێکی خراپە بۆ ئیسلام و، چەند پرۆسەیەکی بێڕەحمانەی لە نێوەڕۆك و جەوهەری خۆ خاڵیکردنەوەی ئیسلامە، کە:

یەکـــــەم: ١- لەلایەکەوە: بەناوی پەیڕەویی لێ کردنی قورئان و سوننەت و، شوێنکەوتنی پێشینی چاك (إتباع السلف الصالح)ەوە: ئیسلام دوا نوسخەی هیدایەتی خوا، بۆ مرۆڤ و جینن، لە جوغزی چەند مەسەلەیەکی فیقهیی گچکەی ڕاجیایی هەڵگردا، کورت بکرێتەوە، وەك:





١- ڕیش هێشتنەوە.

٢- دامێن و دەلینگ هەڵپێچانی پیاوان.

٣- پەچەگرتنەوەی ئافرەتان.

٤- چوون و نەچوونی ئافرەتان بۆ سەر گۆڕستان.

٥- لە تەحییات دا بەردەوام پەنجە جووڵاندن.

٦- دەست لەسەر سینگ گرتن.

٧- لەبەر کەس هەڵنەستان لەبەرو مەجلیسان.

٨- بوغز و دڵڕەقیی بەرانبەر بە زۆرێك لە مسوڵمانان.

٩- بەبۆنەی لەدایك بوونی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) ئاهەنگ گێڕان، بە لادان و تاوانێکی گەورە دانان!

١٠- بەناڕەوا دانانی سەرجەم بۆنە (مناسبة) پیشەیی و مرۆیی و نەتەوەیی و نیشتمانییەکان، بەبێ سەرنجدانی نێوەڕۆکیان!

www.alibapir.com



لەلایەكەوە ئۆممەت، بەو وردە مەسەلانەوە سەرقاڵ بكرێ و بخافڵێنرێ !!

٢- لەلایەكی دیكەشەوە: كارێك بكرێ كە بەردەوام حوكمی میراتیی و بنەماڵەیی، هەر ملی ئەستوور بێ و، پێی مەحكەمتر بێ، بەهۆی فەتوا دەركردنی سەیر و سەمەرەی وەك:

١- قەدەغەكردنی دروستكردنی حیزب و ڕێكخراو!

٢- قەدەغەكردنی خۆپێشاندان و گردبوونەوەی هێمنانە!

٣- قەدەغەكردنی مانگرتن!



٤- قەدەغەكردنی داوای مافی خۆكردن و، نارەزایی دەربڕین لە دەستەڵاتی قۆرخكاری سامان و دەستەڵات!





٥- قەدەغەكردنی ئازادیی بیروڕا، بەتایبەت ڕەخنەگرتن لە حكوومەت و دام و دەزگایەكانی!

**دووەم:** ٣- هەروەها لەلایەكەوە: ئەوپەڕی سەختگیریی توندیی و بێڕەحمیی بەرانبەر بە تەوژمی هۆشیاریی و بێداریی ئیسلامیی بەگشتی و، زاناو پێشەواو بانگەوازكاران(دعاة) و بیرمەندان (مفكرین) بەتایبەت، پێشیان بدرێ.

٤- لەلایەكی دیكەشەوە: ئەوپەڕی تووك نەرمیی، بگرە چەمینەوەو خۆبەدەستەوەدان، لە بەرانبەر جوولەكەو نەصرانییانی دوژمنكار و كینەلەدڵ و، زلهێزانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بكرێتە پیشەی هەمیشە!!

www.alibapir.com





بەڵێ بەڕێزان! دەبێ لەم واقیعەی خۆماندا بژین، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا، نەك لە مێژوودا بژین، شیعە بۆچی سەرکەوتوو نین لە بەڕێوەبردنی حوکم لە عیراقدا؛ چونکە لە مێژوودا دەژین و، ئێستاش هەر بەتەمان تۆڵەی حوسێن بکەنەوە! جارێکیان بە مەلایەکیانم گوت: حوسێن خوا لێی ڕازی بێ، خەڵکی ڕومادیی و فەلووجە نامەیان بۆ نەنارد، بە گورگان خورادووی بدەن؟! هەر باب و باپیرانی ئێوە نەبوون، خەڵکی کووفە و نەجەف، نامەتان بۆ ناردو بە گورگان خواردووتاندا؟! بەڵێ کەسێ لە مێژوودا بژی، هەمیشە دواکەتوویەو، هەرگیز ناتوانێ بەشێوەیەکی شارستانییانەو، واقیعییانە مامەڵە بکات.







لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com





## هەنگاوی حەوتەم و كۆتایی

## هاوسەنگ بوون و، خۆپاراستن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان

ئەمیش زۆر شت دەگرێتەوە، بۆ وێنە:

**١- دنیاداریی و دینداریی:**

مرۆڤ دەبێ هەم دینداریيەكی باش بكات، هەم ئاگاشی لە دنیایەكەشی بێت، چونكە كە دنیای باش نەبوو، دینەكەشی سەلامەت نابێ:



{رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً} البقرة، ٢٠١.





بۆیە نابێ بە بیانووی دینداریی كردنەوە، ژیانی دنیا لەبەرچاوی خەڵك بخەین، وەك هەندێ لە ئەهلی تەسەووفی لادەر، وایان كردوە.

**٢- ڕەسەنایەتیی و هاوچەرخێتیی:**

ئێمە هەم دەبێ ئەهلی ئەسڵ بین، هەم دەبێ ئەهلی عەسرِ بین، ئەسڵی دینەكەمان بپارێزین، بەڵام بە عەقڵێكی هاوچەرخانە و، بزانین لە چ دنیایەكدا دەژین!

**٣- بكرێینەوە بەڵام نەتوێینەوە:**

با بكرێینەوە بە ڕووی فكری بەشەر و، ئەزموونی بەشەر و بەڕووی شارستانییەتدا، بە ڕووی شتە باشەكاندا، هەركەس بەرهەمیان بێنێ،

www.alibapir.com




بەڵام نەك بتوێینەوە و خۆمان لە دەست بدەین، وەك خوای زاناو توانا دەفەرمویَ:

{فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ} الزمر، ١٧-١٨.

واتە: موژدە بدە بەو بەندانەم، کە گویَ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن، بەڵام شوێن باشترینی دەکەون.

**٤- چاک کاروبار و ڕێکخستن، بەبیَ دەمارگیریی:**

دەبیَ کاروباری خۆمان ڕێك بخەین، لە چوارچێوەی حیزب و ڕێکخراوی مەدەنیی و سیاسییدا، بەڵام بەبیَ دەمارگیریی، هەندیَ کەس لەبەر ئەوەی دەبینیَ لایەنێك، حیزبێك دەماگیر(متعصِّب)ە، دەڵیَ: نابیَ کاری حیزبیی و ڕێکخراوەیی هەر بکەین! ئەدی چۆن کار دەکەی، ئایا کاری تاکیی(العمل الفردي) واقیعی پیَ دەگۆڕدریَ؟ ئنجا پێغەمبەرمان موحەممەد وای نەکردوە، بەڵکو ئەو هاوەڵانی خۆی هۆنینەوە، کۆبونەوەی پێدەکردن و پەروەردەی کردن لە نزیکەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕێکخستن(تنظیم)ی هەبووە، تۆش دەبیَ وەك پێغەمبەر بکەی (صلى الله عليه وسلم). ئنجا دنیاش هەمووی وایە، کوردەواریی دەڵێن: تاقەسوار تۆزیَ ناکا! بەڵیَ دەبیَ کاری هەرەوەزیی و دەستەجەمعیی بکریَ، بەڵام بەبیَ دەمارگیریی و بیَ خۆ پەسەندیی.





www.alibapir.com





**٥- عەقڵی هۆشیار و دڵی بێدار:**

دەبێ هەوڵ بدەین هەم عەقڵێکی هۆشیار و، هەم دڵێکی بێدارمان هەبێ و، بە بیانووی ئەوەی کە عەقڵی خۆمان هۆشیار دەکەین، دڵی خۆمان نەمرێنین، کە ئەهلی زیکر نەبین، ئەهلی عیبادەت و پەرستشی شەخسیی پوخت و جیدیی نەبین! هەروەك بە بیانووی خزمەتکردنی دڵیشەوە، عەقڵمان پشتگوێ نەخەین، بەڵکو هەردووکیان بین؛ ئەهلی زیکر بین و ئەهلی فیکریش بین.

**٦- پشت بەخوا بەستن و، هۆکار بەکار بردن:**







نابێ بە بیانووی پشت بە خوا بەستنەوە، دەست لە هۆکارەکان بەربدەین، یان بە بیانووی دەست بە هۆکارەکانەوە گرتنیش، پشت بە خوا بەستن(توکُّل) پشتگوێ بخەین.

**٧- متمانەی ڕەها بە ئیسلام بوون؛ بەڵام ڕەخنەو تێبینیی لەسەر خۆ هەبوون:**

ئێمە زۆرجاران ئەو دووانە تێکەڵ دەکەین، ئێمە وەك مرۆڤ هەرگیز لە کەم و کوڕیی خاڵیی نابین، بەڵام دینەکەمان بێ عەیبە، زۆر جار بە عەلمانییەکان دەڵێم: ئێمە خۆمان کەم و کوڕییمان هەیەو ڕەخنەمان لێ بگرن، بەڵام دەڵێین: دینەکەمان بێ عەیبە، ناڵێین: خۆمان بێ عەیبین و، دەبێ خۆمان چاکتر بکەین، بەڵام ئیسلامەکەمان بێ عەیبە، ئەویش ئەو ئیسلامە کە لە قورئان و سوننەت دا بەرجەستەیە، واتە: ئەو ئیسلامەی کە لە قورئاندا بەرجەستەیە و، پاشانیش لە ڕێبازی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم).

www.alibapir.com





## لەكۆتـــاییدا

**مشوور لێخواردنی ئۆممەتی ئیسلام، لەچوار ڕووەوە، ئەركێكی مەزنی شەرعییە:**

بەڵێ بەڕێزان!

مشوور خواردنی هەركام لەمسوڵمانان، لەئۆممەتی[1] ئیسلام، لە چوار ڕووەوە، ئەركێكی گەورەو قورسی سەرشانیانە:

**یەكەم:** لەوڕووەوە كە بەتەنگەوەبوون و پەرۆشیی هەرمسوڵمانێك بۆ كۆمەڵگاو دەوروبەرەكەی، لەسەری پێویستەو، بەشێكە لەدینداریی و مسوڵمانەتییەكەی، وەك پێغەمبەری كۆتایی (محمد) صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (الدین: النَّصیحة، قلنا: لمن؟ قال: لله ولكتابه ولرسوله ولأئمة المسلمین وعامَّتهم)[2].





واتە: دینداریی: دڵسۆزییە، گوتمان: بۆكێ؟ فەرمووی: بۆ خواو، بۆ كتێبەكەی و، بۆ پێغەمبەرەكەی و، بۆ بەرپرسانی مسوڵمانان و، بۆ كۆی مسوڵمانانیش.

**دووەم:** لەو ڕووەوە كە بەهۆی شل و شێواویی و بەجێماویی، ئۆممەتی ئیسلامەوە، نەك هەركەسانێكی نەشارەزا بەئیسلام، بگرە كەسانێكی

---

(١) ژمارەی مسوڵمانان لە دنیادا دەوری دوومليار (٢٠٠٠٠٠٠٠٠٠) كەس دەبێ و، بەپێی هەندێك سەرژمێریش: ملیارێك و پێنج سەدو نەوەد ملیۆن (١٥٩٠٠٠٠٠٠٠) كەسە.

بڕوانە: ئایدیا دیپلۆماتیك، ژمارە: ٣٨و٣٩/٢٠١٨ز.

(٢) رواه مسلم:٥٥.

www.alibapir.com



مسوڵمانیش، دوودڵیی و بێ متمانەییان بەخودی ئیسلام بۆ دروست دەبێ و، لێی دەكەونە گومانەوە، كەواتە: بۆئەوەی چیدیكە بەهۆی حاڵ و وەزعی بێ سەروبەری مسوڵمانانەوە، كەسانێك شوبهەو ئیشكالیان بەرانبەر بەئیسلام بۆ دروست نەبێ كە: ئەگەر ئیسلام ئاینێكی ڕاست بووایە، حاڵ و باڵی مسوڵمانان ئاوا شپرزو خراپ نەدەبوو! لەسەر تاك تاكیان فەرزە بەپێی تواناییان، مشووری ئۆممەتەكەیان بخۆن، كە لەهەموو ڕوویێكەوە بیبووژێننەوەو، باری لاری، بگرە كەوتووی، هەڵسێننەوە.

سێیەم: لەوڕووەوە كە ئۆممەتی پێغەمبەری كۆتایی (محمد)وەك چۆن لەسەری پێویست كراوە: ئایین و بەرنامەی خوا لەخودی خۆیدا جێ بەجێ بكات، لەسەریشی پێویست كراوە بیشیگەیەنێ بەتێكڕای مرۆڤایەتیی، چونكە هەم قورئانیش و هەم پێغەمبەری كۆتاییش(محمد) بۆ تێكڕای مرۆڤایەتیی - بگرە، بۆ سەرجەم جیننیش - نێرراون، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی:







١ـ (وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ) القلم -٥٢-

٢ـ (وَمَآ أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ) الأنبياء -١٠٧-

ئنجا شتێكی ئاشكراو ڕوونیشە كە باشترین شێوازی بانگەوازو، جۆری گەیاندی پەیام و بەرنامەی خوا بەمرۆڤایەتیی، ئەوەیە كە هەركام لە كۆمەڵگایەكانی مسوڵمانان و ئۆممەتیش بەگشتی، لەسەر ئەرزی واقیع و، لەقەوارەیەكی بەهێزو بەپێزدا، بەرجەستەی بكات.

www.alibapir.com



**چوارەم:** لەڕووەوە کە ئۆممەتی موحەممەد صلی الله علیه وسلم لەسەری پێویست کراوە، بەڵگەو شایەد بێ بەسەر مرۆڤایەتییەوە، وەك خوای تاك و پاك فەرموویەتی:

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴿١٤٣﴾ ﴾ البقرة.

واتە: بەو شێوەیە ئێوەمان گێڕاوە بەچاکترین کۆمەڵ (یان کۆمەڵێکی میانجیی کە نەتێپەڕێنەر بن، نە کورتهێنەر) تاکو بەسەر خەڵکەوە، بەڵگە (یان شایەد) بن و، پێغەمبەریش بەسەرتانەوە شایەد[1] (یان بەڵگە) بێ..

بەڵێ ئۆممەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) لەسەری پێویست کراوە کە:

١ـ شایەدیی لەسەر مرۆڤایەتیی بدات، کە ئیسلام چاکترین و ڕاستترین و تێروتەواوترین ئایین و بەرنامەیەو، بەباشترین شێوە: مرۆڤ لە دنیادا بەختەوەرو، لەدوارۆژدا سەرفراز دەکات.

٢ـ بەڵگەی ڕاستیی و تێروتەواویی ئیسلام بێ، بەسەر بەشەرییەتەوە.

ئنجا بێگومان ئەو ئەرکەشی بۆئەنجام نادرێ، ئەگەر لەهەموو ڕوویێکەوە لەپێش مرۆڤایەتییەوە نەبێ: فیکریی و زانستیی، مەعنەویی و ئاکاریی، سیاسیی و ئیداریی، ئابووریی و گوزەران، خێزانیی و کۆمەڵایەتیی، شارستانەتیی،...هتد.

---

(١) وشەی (شهداء)کۆی (شهید)ە و، ئەویش بەمانای بەڵگە (دلیل)و، بەمانای شایەدییدەریش دێ. بڕوانە: المعجم الوسیط، ص٤٩٧.

www.alibapir.com





هەڵبەتە كاتێكیش خوای بەرزو مەزن، بەئۆممەتی ئیسلامی فەرمووە:

١- ﴿ ....وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١٣٩ ﴾ آل عمران.

واتە: هەرئێوەش بەرزتر (لەسەرووتر)دەبن، ئەگەر بڕوادار بن.

٢- ﴿ وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ ٨ ﴾ المنافقون.

واتە: زاڵیی و باڵادەستیی، تەنیا هی خواو پێغەمبەرەكەی و بڕوادارانە.

بەڵام دوایی واقیع و حاڵی ئۆممەت، پێچەوانەی ئەوە دەبینین، دەبێ دڵنیابین كە: فەرمایشتەكەی خوا لەسەدا سەد (١٠٠/١٠٠) ڕاستە: (وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا) الأنعام -١١٥-.



چونكە خوا نەیفەرمووە: هەركە گوتتان: مسوڵمانین، باڵادەست و سەركەوتوو دەبن، بەڵكو (إیمان)ی تێروتەواوی بەمەرج و گرتووە، واقیعی مێژوویش ئەوەی سەلماندوە كە هەركات مسوڵمانان، ئیمانی ڕاست و ساغیان بووبێ، بەهۆی پابەندییان بە وەحیی و پەیامی خواو، تێگەیشتن و پێگەیشتنیانەوە، لەهەموو ڕوویێكەوە سەرقافڵەی مرۆڤایەتیی بوون و، بەواقیعی ژیانی ئیماندارانەیان، بەڵگەو شایەدی، ڕاستیی و بێ هەڵەو پەڵەیی بەرنامەی خوا بوون، بەسەر بەشەرییەتەوە.





كەواتە: لەهەموو ئەو ڕووانەوە، لەسەر تاك تاكی مسوڵمانان پێویستە، كاربكەن بۆ بووژاندنەوەی ئیسلام و ڕاستكردنەوەی باری لاری ئۆممەت.

سبحانك اللّهم وبحمدك،

أشهد أن لا إله إلاّ أنت، أستغفرك وأتوب إليك

www.alibapir.com





# نێـــوەرۆك









www.alibapir.com











www.alibapir.com










لە ڕێی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
English - عربي - كوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com

# واقیعی دژواری ئوممەت

ئەم کتێبە، کە کتێبی یەکەمە، لە مەوسووعەی دوازدە ئاڵقەی: [بەرەو باشتر تێگەیشتنو پێگەیشتن] تێیدا باسی واقیعو هەل و مەرجی شل و شێواو و بەجێماویی ئوممەتی ئیسلام و، هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ئەو واقیعە تاڵ و سەختە و، پاشان ڕێیەکانی لێ دەربازبوونی کراوەو، بە کورتییو بەکوردیی:

لەم کتێبەدا هەوڵمانداوە، ڕاستەوخۆو بەڕوونیی پەنجە بخەینەسەر دەردو نەخۆشییە جۆراوجۆرەکانی ئوممەتی ئیسلام بەگشتییو، ڕەگ و ڕیشەو هۆکارەکانی پەیدابوونو تەشەنەکردنیانو، ڕێبازو شێوازەکانی چارەسەرکردنو بنبڕکردنیشیان.

www.alibapir.net

/alibapir1

/alibapir


لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
PDF
عەلی باپیر/AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر



**نووسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوە

هەولێر - شەقامی ٦٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice

نرخی 2.500 دینار



9 789922 632100